یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
لە کوردستاندا
49
لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی پێنجەم - حوزەیرانی ٢٠١٢

ڕۆژنامەنووسان لە نێوان ئەرک و مافەکانیاندا

فرینی شەهێن

هەمیشە پەلەکردن پەشیمانی لەدوایە!!

پێی بڵێ خۆشمدەوێیت

هاوڕێی نیوەڕێ..

بیرکردنەوەت بگۆڕە..

پەیامێک بۆ بەڕێوەبەر: کاتی خانەنشین بووتە!!!

لەگەڵ تاهیر بەگی جاف دا

ئەو کەسەی بیەوێت مۆمێك
لە گڕەکەیەوە بگرێت،
دەستی دەسووتێت!



The first Magazine Specialized
in Management and Human
Development in Kurdistan

له پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا




مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی پێنجەم - ژمارە 49 - حوزەیرانی 2012

NO. 49










ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی-
نهۆمی سێیەم- نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٣١٩٣٩٤٦ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر - شەقامی تاران - کۆمپانیای ڕەسەن -
نزیك وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەو نیشتەجێبوون

٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

E-mail: bryarmagazin@gmail.com



دابەشکردن: کۆمپانیای پەیك

٠٧٧٠٨٦٤٩٢١٠

بەشی ڕیکلام
07480112787

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد

نرخ 2500 دینار






# ڕۆژنامەنووسان لە نێوان ئەرکو مافەکانیاندا

ئەو کەسەی لە ژیانی خۆیدا، بە ئیختیاری خۆی ڕێگاو ڕێبازو ڕەوتێك هەڵدەبژێرێت، دەبێت لە پێناویدا ئامادەی قوربانیدانو ماندووبوونو هەندێجار مەحروم بوونیش ببێت، لە زۆر شت لەو پێناوەدا.

گەورەییو بەرزی ئامانجەکان وا لە مرۆڤ دەکەن کە چاوپۆشی لە زۆرێك لە خۆشیو باقو بریقی ژیان بکاتو بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە ئاوڕ بۆ لای هیچ شتێك نەداتەوە، کە لە ئامانجەکەی دووری دەخەنەوە!

کاری ڕۆژنامەنووسیش یەکێکە لەو کارە دژوارانەی کە وەختێك مرۆڤ وەکو پیشەیەك هەڵیدەبژێرێت لە ژیانیداو ئامانجی ئەوەیە کە لەم ڕێگایەوە خزمەت بە کۆمەڵگا بکاتو ڕاستییەکان ڕوون بکاتەوەو دەستو چاوی هەمیشە وریای مرۆڤەکان بێت، دەبێت ئەوە بزانێت کە نەك هەرنابێت چاوەڕوانی دەستکەوتی ماددی بکات، بەڵکو دەبێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی زۆر ناڕەحەتیو هەڕەشە خۆی ئامادە بکات!

دەبێت ڕۆشنبیرانو ئازادیخوازانو خەباتگێڕان، پێش ئەوەی بیر لە مافەکانیان بکەنەوە، بەوپەڕی دڵسۆزیو لە خۆبوردنەوە ئەرکەکانیان ئەنجام بدەن.

پێویستە لە خودی خۆیان بپرسن کە ئایا تا ئێستا چییان کردووەو تا چەند توانیویانە زمانحاڵی میللەتو ڕابەری ڕاستەقینەیان بن، تا چەند بێبەرامبەر توانیویانە خزمەت بە گەلو نەتەوەکەیان بکەن؟!

چونکە گەورەیی ئەوان لە گەورەیی کارو ئامانجو دەستکەوتەکانیاندایە، لە ڕابەرایەتیکردنی ڕاستەقینەی میللەتدایە، ئەوان ڕۆحی هەمیشە زیندوو گیانی پڕ لە بزاڤی گەلن!

هیواو ئاواتەکانیان سەرکەوتنی نەتەوەو پێشکەوتنی وڵاتو نیشتمانە، هەمیشە لە خەیاڵی خەمی خەڵکدانو خەمەکانی خۆیان بیرچۆتەوە، لە بیری دابینکردنی ژیانو گوزەرانو مافەکانی تاکەکانی کۆمەڵگادان، هەر کاتێك باسی هەر ئیمتیازاتێکی ماددی کرابێت، دەبێت ئەوان شەرمیان کردباو خۆیان لەدوای کاروانەوە بینیبێت.

کاتێك ڕۆژنامەنووس دەمی دەگاتە لێپرسراوێك، نەك سەرەتا نابێت داواکاری کەسی خۆی هەبێت، بەڵکو ڕێگە بە خودی خۆی نادات، هەرگیز داواکارییەکانی هێندە بچووك ببنەوە کە لەبەرژەوەندی خودی خۆیدا ڕەنگ بدەنەوە!

هاوکات کێشەکانی ڕۆژنامەنووسیش پێدانی پارچەیەك زەوی، یاخود مووچەیەکی باش نییە!

ڕۆژنامەنووس لەبەردەرگای سوڵتان ناڕەزایی دەرنابڕێت، لە پێناو مافێکی ماددیدا!

چونکە ئەو کاتەی ڕۆژنامەنووس تەنها لە خەمی خۆیدا دەژی، هێندە بچووك دەبێتەوە لە چاوی دەسەڵاتدا، کە هیچ کاریگەرییەکی نامێنێتو هیچ حسابێکی بۆ ناکرێت!

ڕاگەیاندن کە چەکی دەستی ڕۆژنامەنووسانە، سەرچاوەی داراییو ئابورییەو دەبێت ڕۆژنامەنووسانو میدیاکاران خۆیان بتوانن لە ڕێگای پڕۆژەکانیانەوە، سەربەخۆیی دارایی خۆیان مسۆگەر بکەن، نەك دەست لەو دەسەڵاتە پان بکەنەوە کە هەوڵی چاکسازیو گۆڕانکاری تێدا دەدەن.

هاوکات پێویستە ئێمە ئەوەندە باس لە مەزلومییەتو مافخورانی خۆمان نەکەینو لێپرسینەوەیەکی جیدی لەگەڵ خۆماندا بکەینو کارەکانمان هەڵسەنگێنین.

با تەماشایەکی ڕۆژنامەوانی جیهان بکەینو بزانین چەندە کاریگەرییان لەسەر ڕەوتو سیاسەتی وڵاتان هەیەو بە چ شێوەیەك توانیویانە ببنە زمانحاڵی میللەتانو دەنگی ڕاستبێژو هەق ویستو دوور لە پاشکۆیەتیو تەسلیم بوون بە دەسەڵاتن.

با ئێمە ئەرکەکانی خۆمان جێبەجێ بکەین، بێگومان مافەکانمان نافەوتێت!

# کارگێڕی بە گوفتار

لەسەرخۆبە، لە کاتی هەڵبژاردنی هاوڕێدا، زیاتریش لەسەرخۆبە، لە کاتی گۆڕینیدا.

بنیامین فرانکلین

ئەوەی نابینێ، ناگری!

فیکتور هۆگۆ

ئەو نەتەوەیەی مێژووی خۆی دەپارێزێت، ئەوە خودی خۆی دەپارێزێت!

راشد روستم

ئەو کەسانەی کە ڕابردوویان بیرنەماوە، دەبێت جارێکی تر دووبارەی بکەنەوە!

جورج سانتیانا

مانای ئەو شتە فێربە، کە دەتەوێت بیڵێیت، پاشان چۆن دەتەوێت قسە بکە!

ئەیبکتیکوس

ئەگەر کوڕێکت فێری خوێندەواریو زانست کرد، ئەوا تەنها کەسێکت فێرکردووە، بەڵام ئەگەر کچێك فێر بکەیت، ئەوا نەتەوەیەکت فێر کردووە!

ئیبن بادیس

## کارگێڕی بە چیرۆك

# هەمیشە پەلەکردن پەشیمانی لەدوایە!!

ڕۆژێکیـــان جەنگیزخان بۆ گەشــت چووبووە دەرەوەو جگە لە (هەڵۆ)یەك کە هاوڕێی گەشتەکەی بوو، کەسی تری لەگەڵ نەبوو، زۆر بــە ڕێگادا ڕۆیشــتن‌و لــە دوای ماندووبوونێکی زۆر، تینوێتی زۆری بۆ هێنان!

جەنگیزخان ویستی ئاو بخواتەوە، لە دامێنی چیاکە کانییەکی بەدیکــردو کوپێکی لێ پڕکردو ویســتی بیخواتەوە، بەڵام هەڵۆکە بە باڵەکانی هێرشی دەکردە سەر کوپەکەو دەیڕژاندو نەیدەهێشت جەنگیزخان ئاوەکە بخواتەوە، تا ســێ جار ویســتی کوپە ئاوەکە بخواتــەوە، بەڵام لە هەمــوو جارەکاندا بە هەمان شــێوە هەڵۆکە ئاوەکەی دەڕژاندو نەیدەهێشت بیخواتەوە!!

(خان) زۆر بەم کارە توڕەبوو، شمشێرەکەی هەڵکێشاو بۆ جاری چوارەم کاتێك هەڵۆکە ویستی ئاوەکە بڕێژێت، بە شمشێرێك سەری لە لاشەی جیاکردەوەو هەڵۆکە لە خوێنی خۆیدا گلا..

(خان) هەســتی بــە ئازار کــردو زۆری پێناخۆشــبوو، کاتێك هاوڕێکەی بینی لە خوێنی خۆیدا شەڵاڵە، بە بینینی ئەو دیمەنە زۆر نیگەران بوو، دوای هەڵوێســتەیەك ڕووی کردە، ســەرچاوەی کانییەکەو تەماشــای کرد، مارێکی زۆر گــەورە لە نێو کانییەکەدا تۆپیوەو کانیاوەکە ژەهراوی بووە.

ئەو کاتە (جەنگیزخان) زانی کە هاوڕێکەی ویســتی ســوودی پــێ بگەیەنێت‌و لــەو بەڵایە بیپارێزێت، بــەڵام کاتێك ئەمەی بۆ دەرکەوت کە کار لە کار ترازابوو..

لاشــەی هەڵۆکــەی هەڵگــرت‌و لــە پەڕۆیەکی پێچــاو کاتێك گەیشــتەوە نێو ســەربازو پاســەوانەکانی، فەرمانــی دا، پەیکەری هەڵۆیەك لە ئاڵتوون بتاشن‌و لەسەر باڵەکانی بنووسن:

(هــەر کارێــك هۆکارەکــەی توڕەبــوون بێــت، ئەنجامەکەی شکستهێنانە)!

لەم چیرۆکەوە فێردەبین:

١- ئەو بڕیارانەی لە کاتی توڕەبووندا دەدرێن، هەمیشە مایەی پەشــیمانین، لەبەرئەوە پێویستە مرۆڤ لە کاتی توڕەبووندا هیچ نەڵێت‌و هیــچ بڕیارێك نەدات، هەروەکو چۆن پێویســتە لە کاتی خۆشحاڵیشدا ئاگای لە پەیمانەکانی بێت.

٢- با بە ئاسانی هاوڕێ خۆشەویستەکانمان لە دەست نەدەین، بە دەســتی خۆمان لە خۆشەویسترین کەســمان خۆمان مەحروم نەکەین.

٣- با وتەو ئامۆژگاری هاوڕێ دڵســۆزەکانمان توڕەمان نەکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە گوێیان بۆ بگرین‌و سوودیان لێوەربگرین.

٤- کورد دەڵێت: دۆســت ئەو کەسەیە کە دەتگریەنێت، دوژمن ئەو کەسەیە کە پێت پێدەکەنێت، با بزانین کە دۆستی ڕاستەقینە ئەوانەن کە ڕاستیمان پێدەڵێن، با لەسەر دڵیشمان گران بێت.

٥- بۆ ئەم زەمانە دژوارە هاوڕێی باش‌و دڵسۆز، گەنجینەیەکی بێ سنورە، با هەوڵبدەین، ئەو کەسانە بکەینە هاودەمی خۆمان.

٦- دۆستی ڕاســتەقینە ئامادەیە لە پێناوی هاوڕێکەیدا گیانی خۆی بکاتە قوربانی‌و بۆ پاراستنی هەموو هەوڵێك دەداتو هەرگیز ناتوانێت بەرامبەر هەڵــەی هاوڕێکەی، یان هەر دژوارییەك ڕووی تێدەکات، بێدەنگ بێت.

٧- هەرگیــز بــە هەڵەیەك، یــان پەرچەکردارێکی هاوڕێکەت، بڕیار مەدە لە دەستی بدەیت، هەمیشە چاکەو کردارە جوانەکانیت لە یاد بێتو بە خراپەیەك چاکەکانی مەسڕەوە.

# تەنها بۆ سەرکردەکان

## ئەگەر ناتەوێت سەرکردەبیت،ئەم لاپەڕەیە مەخوێنەرەوە!

جیهان لە دوو بەش پێکدێت،
کەسانێك دەزانن چی دەڵێن، ئەگەر
بدوێن، بەڵام ناتوانن..
کەسانێکیش هیچیان پێ نییە بیڵێن،
بەڵام بێدەنگ نابن!

شاعیری ئەمریکی (روبرت لی فرووست)

باوکم وەسیەتی بۆ کردم، بە سێ
شت،کاتێك دەمەوێت بەرامبەر بە
خەڵکی بدوێم: (ڕاستگۆبە،
بە کورتی بدوێ، پاشان دانیشە)

جیمس روزفلت

کاتێك کە سەرکردە
ناوازەکان کارەکانیان تەواو
دەکەن.. خەڵکی دەڵێن:
کارەکانمان ئەنجامدا!

لاوتسو

دامەنیشەو
چاوەڕوانی (هەل) بکەیت،
هەڵسەو دروستی بکە!

مدام – سی.جی وکەر

سێ سیفاتی زۆر پێویست
هەیە بۆ سەرکردە:
(خۆبەکەمزانین (تواضع) +
ڕوونی + ئازایەتی)!

تشان ماستەر

ئەگەر ڕوانینم دوور تر بوو، لە
کەسانی تر، ئەوە مانای ئەوەیە
کە من لەسەر شانی گەورە پیاوان
ڕاوەستاوم.

نیوتن



# ١٠ ئاماژە لە ژیانو بەڕێوەبردندا

بەشی پێنجەم

و: ڕەهبەر مەسعود

**٤٥- بە کەمترین زەرەر تێی پەڕێنە:**

هاوڕێ، ئەگەر بێتو پەرچەکردارەکانمان قەبارەکەی گەورەتر بێت، لە ڕووداوەکانمان، ئەوا تەنها لە (١٠٪ )ی بەدەستدەهێنین، بەڵام ئەگەر قەبارەکەیان بە ئەندازەی قەبارەی ڕووداوەکان بوو، ئەوا (٩٠٪) ی بەدەستدەهێنین، جا ئەگەر بارودۆخەکان وەهابێت، بۆچی خۆمان کۆنترۆڵ نەکەینو پەرچەکردارەکانمان ئەرێنی نەکەین، بەوپەڕی ئارامیو ئازایەتییەوە ڕووبەڕووی ڕووداوەکان نەبینەوە؟

ژیانیش شوێنێکە بۆ پەڕینەوە، نەك شوێنی تێدا مانەوە، بۆیە با ژیان تێپەڕێنین بە کەمترین زەرەروزیان.

**٤٦- لە سەر تۆ حیسابە:**

هەندێجار ڕەنگە پرسیار لە خۆت بکەیت، کە بۆچی بەڕێوەبەرەکەم بەردەوام ئامۆژگاریو ئاماژەی نوێمان ئاڕاستە دەکات؟ ئایا ئەو چی لە ئێمە دەوێت؟ ئایا ئەو دەیەوێت چاکمان بکات؟ یان دەیەوێت کارەکان بەوردی بەڕێوەبچێت؟

بڕوا بکە خۆشەویستم کارەکە بەهەر شێوەیەك بێت سوودەکەی بۆ تۆیە، چونکە بەو هۆیەوە دەتوانی گەشە بە تواناو ئەرکەکەی خۆت بدەیتو شێوەی ئەداکردنەکەت زۆرباش بکەیت، بۆیە هەر ڕێنماییو قسەیەك کە لە دەمی بەڕێوەبەرەکەت دێتەدەرەوە، تەنها بۆ چاکەی تۆو کارەکەتە.

**٤٧- مەیلێ، بینووسە:**

کاتێك تۆ ئۆتۆمبێل لێدەخوڕی، یان لەسەر جێگایەکەت ڕاکشاویت، یان چاوەڕێی کەسێك دەکەیت، یاخود بەهەر شێوەیەکی تر بێت، گەر بیرۆکەیەکت بۆ هات پەیوەست بوو بە کارەکەت، یان بەرژەوەندییەکی تێدابێت بۆ کارەکەت، ئەگەر هەڵنەستیتو لە پەڕەیەکدا نەینووسیتەوە، ئەوا بێگومان لە بیرت دەچێتو نامێنێت، ڕەنگە هەوڵبدەی بەبیر خۆتی بهێنیتەوە، بەڵام لەبەر زۆری سەر قاڵی نایەتەوە بیرت، هەر بۆیە بەردەوام منیش قسەی ئەو هاوڕێیەم دەهێنمەوە یادم کە دەیگوت: مەیلێ، بینووسە.

**٤٨- هەموومان شکستمانخواردووە:**

ئەو پەرتووكو بابەتانەی کە دەستت دەکەوێت، یاخود ماوە ماوە پێتدەگات، هەوڵبدە بیانخوێنیتەوە، ئەگەر خوێندتەوە هەوڵبدە تێیان بگەیت، گەر تێیان گەیشتیت هەوڵبدە وەك خەڵاتێك بۆ کەسانی تریش باسی بکەی، تاوەکو ئەوانیش سوودی لێوە ببینن.

بەڵام ئەگەر نەتخوێندەوە، ئەوا هەموومان شکستمانخواردووە.

منیش شکستمخواردووە، چونکە نوسیوومەو نەم خوێندۆتەوە.

تۆش شکستتخواردووە، چونکە خەڵاتە ئامادەکراوەکەت بەدەستناگات.

**٤٩- ئایا تۆ لە کارەکەت ڕازیت؟**

(کای کلبیر) نووسەری پەرتووکی (بەدەستهێنانی ڕەزامەندی لە وەزیفە) دەڵێت: ئەگەر وەزیفەیەکت هەبوو پێشی ڕازیبوویت، ئەوا هەر بەسروشتی خۆی تێدا سەرکەوتوو دەبیت، بەتایبەتی لەلایەنە مادییەکەی، ئەمە جیا لەوەی لە لایەنی دەرونیشەوە سوودێکی زۆرت پێدەگەیەنێت، وەك هەستکردن بە دڵخۆشی لە کاتی کارکردن، بەدەستهێنانی ڕەزامەندی، ئەمەش وا دەکات زیاتر داهێنان لە کارەکەتدا بکەیت. جا لێرەوە سەیری ناوەوەی خۆت بکەو بزانە تۆ لە کارەکەی خۆت ڕازیت؟ کەواتە بەدوای وەڵامو بڕیارێکی دروستدا بگەڕێ.

**٥٠- لەگەڵ سەرکەوتوان بە:**

وتەیەکی جوانم خوێندەوە کە دەڵێت:

کەسی سەرکەوتوو بیر لە چارەسەر دەکاتەوە، دۆڕاویش بیر لە کێشە دەکاتەوە.

کەسی سەرکەوتوو بیرۆکەکانی کۆتایی نایەت، دۆڕاو پاساوەکانی کۆتایی نایەت.

ئایا تۆ حەزت دەکەیت لە کامیان بیت؟!!

سەیری بابەتی (بەراوردێك لە نێوان سەرکەتوو دۆڕاو) لە ژمارە ٥ بڕیاردا بکە.

**٥١- باش بیربکەوە، زۆر بەدەستدەهێنیت:**

ئەو کەسەی دەتوانێت داهاتەکەی بگەیەنێتە یەك (ملیۆن) دۆلار، زیاتر کار ناکات لەو کەسەی کە داهاتەکەی دەگاتە (١ هەزار) دۆلار.

خاڵی جیاوازی نێوان ئەو دوو کەسە لە چۆنییەتی بیرکردنەوەو ڕێگاکانی جێبەجێکردنی بیرۆکەکانیانە، لەوەش گرنگتر ئەوەیە کەسە سەرکەوتووەکە مێشکی بەکار دەخات بە شێوەیەکی ڕاستو دروست، بۆیە ئێمەش داواکارین لە (خودای) گەورە عەقڵێکی ساغو دروستمان پێببەخشێت، جا ئەوەی بەکاری بهێنێت زۆر بەدەستدەهێنێت.

**٥٢- خۆت مەخەرە ژێر چاودێرییەوە:**

ئەگەر سەرۆکەکەت متمانەی پێبەخشیویتو لە سەر گەورەو بچووکی کارەکانت زۆر لێپێچینەوەی لەگەڵدا نەکردیو دەسەڵاتی تەواوی پێدای، هەوڵبدە ئەم متمانەیە لەدەست نەدەیت، یان هەڵنەقۆزییەوە، چونکە گەر بەو جۆرە هەڵسوکەوتت نەکرد، ئەوا سەرۆکەکەت ئەو متمانەیەی لا نامێنێتو دەتخاتە ژێرچاودێرییەوە، لەسەرجەم کارەکانت لێپێچینەوەت لەگەڵدا دەکات، بۆیە پێویستە ئەو متمانەیە بەهێز بکەیتو دەروونت ئاسوودە بکە.

**٥٣- کاتژمێرەکەت لەلایەك دابنێو دەستبەکاربە:**

تۆ کە کاردەکەیت، زۆر سەیری کاتژمێرەکەت مەکە بۆئەوەی بزانی چەند ڕۆیشتووە؟ چەندی ماوە؟ چەند بەسەرچووە؟ ئەوە هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت تەنها ئەوە نەبێت دوو دڵی زیاد دەکات، وا مەکە بەڵکو کاربکە، دیسان کاربکە، چونکە ئەگەر کەسێك کارەکەی خۆی خۆشبوێت گوێ بەوە نادات کە ئاخۆ کات چەند ڕۆیشتووە، یان چەندی ماوە، بەڵکو هەوڵدەدات بەرهەمەکەی زیاد بکات، جار لەدوای جار، گەر بارودۆخەکە بەمشێوەیە بوو، ئەوا خۆتو سەرۆکەکەشت ڕازی دەکەیت.

کەواتە خۆشەویستەکەم کاتژمێرەکەت لەلایەك دابنێو دەستبەکاربە.

کارگێڕیزان

# پەیامێك بۆ بەڕێوەبەر: کاتی خانەنشین بوونتە!!!

ئا: م. هاژە شێروانی

لە چوارچێوەی بەرپرسیاریەتیت نییە وەکو بەڕێوەبەر کە پێویستیت بە خۆشویستنی سەرجەم فەرمانبەرەکانت هەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر خۆشت نەخەیتە نێو کێبڕکێی دەستخستنی خۆشەویستی هەموویان، ئەوا هەر پێویستە لەسەرت کە لێیانەوە دوورنەکەویتەوەو هەستی نامۆبوونیان لەلا دروست نەکەیت، ئەمە لە کاتێکدا کە بتەوێت بە ڕاستی فەرمانبەرانی بەرهەمهێنەربن، ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەتی لەسەر ئەو دامەزراوانە جێبەجێدەبێت کە هەڵدەستن بە پرۆسەکانی لە یەککردنەوەو بە ڕێکردنی کارمەندەکانیان، یان ئەوەی کە دووبارە خۆی ڕێکدەخاتەوە، یان ئەوەی هەندێك گۆڕانکاری دەکات کە گیانی مەعنەوی هێزی کاری بەرزدەکاتەوە، کرۆکی پارێزگاریکردن لەسەر پەیوەندی باشی لەگەڵ فەرمانبەرەکانی بریتییە لە گەیاندنێکی ڕاستو دروست لەگەڵیان، تا ئەوەی کە کارگێڕی هەمیشە بە تەنگ ئەوەوە نابێت کە بزانێت چی لە ناخو زەینیاندا هەیە.

هەر سەبارەت بە پەیوەندیو گەیاندنی ڕاسترەوە لەگەڵ فەرمانبەرەکانی کە پرسیار گەلێك سەرهەڵدەدات لەسەر هۆکاری دوورە پەرێزی فەرمانبەرەکان لە ناساندنی بیرۆکەکانیان، یان پێشکەشکردنی ڕاو سەرنجو گازندەکانیان، لە پاڵ پێشکەشکردنی ڕەخنەو ئامۆژگاری زۆر بە کەمی، کە دیارترین هۆکاریش دەگەڕێتەوە بۆ ترسی فەرمانبەران لە هەڵوێستە خراپەکانی دامەزراو لە بەرامبەریان ئەگەر هاتوو ڕەخنەگربوون کە لەم ساتەدا تەنها کەسێکی ئازا دەدۆزێتەوە کە ئامادەیە مەترسی بخاتە سەر پێگەکەی، بە خستنەڕووی شتگەلێك کە بۆ کارگێڕی کۆمپانیا ناگونجێت، کە لەوانەشە ئەم ترسەشیان لە واقیعدا هیچ بنەمایەکی نەبێت، بەڵام بە تەواوی دەبێتە هۆی لە ناوبردنی ڕاسترەوی لە نێوان فەرمانبەرەکان کە دەرەنجامیشی، یان ئەوەی کە فەرمانبەرەکانی تووشی بێدەنگی دەبن، یان هەڵدەستن بە خستنەڕووی گلەییەکانیان بۆ خێزان، یان هاوڕێ، یان هاوکارەکانیان، کە لەم ساتەشدا فەرمانبەرەکان بە هیچ شێوەیەك بە دەنگ کارگێڕییەوە ناچن تا ئەوەی کە نەزاننو دڵنیانەبن لە پێشوازی کارگێڕی بۆیان بە گفتوگۆی ڕاستو دروست لەگەڵیان.

هەروەکو دەگێڕنەوە بەرپرسو خاوەنی دامەزراوەیەك بە بەڕێوەبەرەکەی ڕاگەیاند: خانەنشینت دەکەم.

ئەویش وەکو ئەوەی لەگەڵ بیستنی ئەم قسەیە بکێشرێت بەسەریدا، بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی: بەڵام من هێشتا نەگەیشتوومەتە تەمەنی خانەنشینی؟!!

ئەویش وتی: دەزانم، بەڵام بیرۆکەو شێوازی کارکردنتە لەگەڵ بەردەستەکانت کە پیربوونو بە کەڵکی کارکردن نایەن، هەر بۆیە دەبێت خانەنشین بکرێیت!

کەواتە لە ژێر ڕۆشنایی ئەم گفتوگۆیەی کە لە نێوان بەرپرسی دامەزراو (خاوەنەکەی)و بەڕێوەبەرەکەی دروستبووە، بۆمان دەردەکەوێت کە تەمەنی بەڕێوەبەرەکە نەگەیشتۆتە خانەنشینی، بەڵام بیرۆکەو شێوازی کارکردنییەتی کە گەیشتوونەتە ئەم قۆناغە، ئەمجۆرە کەسانەو سەدانو بگرە هەزارانی تریش لە دەستەو دامەزراوو فەرمانگەو دایەنگەو خوێندنگەو زانکۆو خودی

بەڕێوەبەرایەتـــیو وەزارەتەکانیش بەرچـــاو دەکەون، جا لە هەر ئاستێکی هەرەمی ڕێکخســـتندابن، جیاواز نابێت ئەوە نەبێت کە تا لە ئاســـتی باڵابێت کارەساتەکە گەورەترو گەورەتر دەبێت، کە بەمەش هەم کاریگەری نەرێنی لەســـەر خودی ئامانجو بەرهەمو خزمەتگوزارییەکانـــی دەبێـــت، لە پـــاڵ کاردانـــەوەی نێگەتیڤی دەوروبـــەرو کۆمەڵگاشـــی لێدەکەوێتـــەوە، دیارە کـــە ئەمەش بۆ خـــودی کەســـایەتیو لێزانیو شـــارەزایی هونـــەریو مامەڵەکاری بەڕێوەبەرەکان دەبێت لەم دامەزراوانەدا، هەر ئەمەشە بە زیانی سەرەتاو کۆتاییو مانەوەی دامەزراو تەواو دەبێت.

کەواتە ئاگاداربە:

کـــە بینیـــت کارمەندەکانـــت بـــە لێشـــاو پرتـــەو بۆڵەیـــان لێبەرزبـــووەوە، ئـــەوا بزانـــە کە بیرۆکـــەو شـــێوازی کارکردنت خانەنشین بووە.

کـــە داواکاری گواســـتنەوەی ڕاژەت بە لێشـــاو خرایە بەردەم، بزانە کە شێوازت لە مامەڵەکردن لەگەڵیان خانەنشین بووە.

کە هاندەرێك بوویت بـــۆ دیاردە ڤێزە ونەکانی ناو کارگێڕی لە خۆدزینەوە لە کارو هەڵنەگرتنی بەرپرســـیاریەتیو نەزانینی ئەرکەکانت، وەکو بەرپرس ئەوا بزانە کاتی خانەنشین بوونتە.

*کاتێك کە پابەندنابیت بە ڕێنماییو ڕێســـاکان، ئەوەی کە جۆری کارو چالاکی لەســـەرت دەســـەپێنی، ئەوا کاتی خانەشـــین بوونتە.

*کاتێـــك کـــە لەســـەر بنەمـــای خـــزم خزمێنـــەو نزیکیو برادەرایەتـــیو جیاوازیکـــردن، کارەکانـــت ڕایی کـــرد، ئەوا کاتی خانەنشین بوونتە.

*کاتێك کە پێشێلی سەرجەم بنەماو تیۆرییەکانی کارکردنت کردو بە هەرەمەکی پاراستنی بەرژەوەندیت بڕیارتدا، بزانە کاتی خانەشین بوونتە.

*کاتێك کە ڕێنماییەکانی پاداشـــتو سزادان ونبوونو لەسەر بنەمـــای کاریگـــەری کەســـێتی بڕیارتدا، بزانە کاتی خانەنشـــین بوونتە.

*کاتێـــك کە ڕێنمایـــیو دەســـتوورگەلێکی وەهمیت هێنایە شـــوێنی کارکردنتو هەر بە زارەکی پابەندبوونو پێداگری خۆت لەسەر ڕاگەیاند، بزانە کاتی خانەنشین بوونتە.

*کاتێـــك کـــە دیـــاردەی وەرگرتنـــی مۆڵەتو غیـــاب بوونی فەرمانبەرەکانت بەرزبووەوە، بزانە کە کاتی خانەنشین بوونتە.

*کاتێك کە پاڵپشتو یارمەتیدەری داهێنانی کارمەندەکانت نەکرد، بزانە کاتی خانەنشین بوونتە.

*کاتێـــك کارمەندەکانـــت ئامادەنەبوون هیچ پێشـــنیارێکت بخەنە بەردەم بۆ بەرەوپێشـــبردنی دامەزراوەکـــەت، بزانە کاتی خانەنشین بوونتە.

*هـــەر کاتێك گوێگرێکی بـــاش نەبوویت بۆ کەمتەرخەمیو کەمو کوڕییەکانی دامەزراوەکەت، بزانە کاتی خانەنشین بوونتە.

*کۆتایـــش کاتێـــك سەرمەشـــق بوویـــت لە دزینـــی داهاتی دامەزراوەکـــەت، لـــە تەزویرکـــردنو گۆڕینـــی پســـوڵەی کڕینو پڕکردنەوەی پســـوڵەی بەتاڵو کار بەرامبەرکردنت پەیڕەو کرد، لە کار ڕاییکردن، بزانە کاتی خانەنشین بوونتە.

*هەر وەکو دەڵێن: ئەگەر گەورە ئاو نەڕژێ، بچووکیش پێی لێناخشێنێ!





# ٥٠٠ بیرۆکەی قەشەنگ بۆ ڕێکخستنی هەموو شتێك...



ن: شیری بایکۆسفی..
و. بۆ عەرەبی: محمد عنان..
و. بۆ کوردی: زانکۆ قەرەداغی

## چاکترین شێوازو کەرەستە بۆ ڕێکخستنی ژیانت، لە ئۆفیسو ماڵ، لە کاتی خوێندنو کارو سەفەرو بازاڕدا...

**١٥٦- بەکارهێنانی کورتکراوەکانی کیبۆرد:**

بەتێپەڕبوونی کاتێکی زۆر بەسەر بەکارهێنانی کۆمپیوتەرەکەتدا، دەتوانیت پاشەکەوتی کاتێکی زۆرت کردبێت، ئەویش بە بەکارهێنانی جێ پەنجەکانی سەر کیبۆرد بۆ جێبەجێکردنی هەندێك فەرمانی کۆمپیوتەری، لەبری جێبەجێکردنیان بە ڕێگەی ئاسایی (ماوسو کلیك)، بە تایبەت ئەو کارانەی کە زۆر دووبارە دەبنەوە، هەر پرۆگرامێك دوو ڕێگە، یان زیاتر فەراهەم دەکات بۆ جێبەجێکردنی هەر فەرمانێك، کۆشش بکە خۆت ڕابهێنی لەسەر ئەو ڕێگە کورتانەی لە ڕێی کیبۆردەوە فەرمانەکە جێبەجێ دەکاتو بەمەش کاتێکی زۆرت بۆ دەگەڕێتەوە، ئەگەر بتوانی ئەو مەشقە بکەیتو خۆتی لەسەر ڕابهێنیت، ئەوا هەست بە شادیو حەوانەوەش دەکەیت.

**١٥٧- ئەرکەکانی ماکرۆ (Macro):**

زۆربەی ئەو پرۆگرامانەی کە مامەڵە لەگەڵ وشەو نوسین دەکەن، فەرمانێکی لە خۆگرتووە کە پێیدەوترێت (ماکرۆ (Macro)) کە بریتییە لە کۆمەڵێك ئۆردەر-أوامر- کە جێبەجێکردنی ڕستێك فەرمانی یەك بەدوای یەکی بەدوادادێتو بەکارهێنەر دەتوانێت بەگوێرەی ویستی خۆی دیزاینی بکات، ئەوەش بە یەکجار دەستنان بە یەك جێ پەنجەدا دەبێت. زۆر بەسوودە ئەگەر مەشق بکەیتو شارەزایی پەیدا بکەیت لە تایبەتمەندییە پێشکەوتووەکانی ئەو پرۆگرامەداو بیخەیتە پاڵ ئەو شێوازانەی لە بەکارهێنانی کۆمپیوتەردا پشتی پێدەبەستیت، بنەمایەك هەیە دەڵێت هەر جێ پەنجە (کلیکێك) کاری خۆی فەراهەمدەکاتو لە بەرامبەریشەوە هەلی پەنجەنان بەسەر کلیکێکی تردا بۆ دروست دەبێت.

**١٥٨-لایەنە باشەکانی هەڵگری پرینتەر (جێپرینتەر):**

ئەگەر توانیت جێپرینتەرێك بکڕیت، ئەوا لەو جۆرە هەڵبژێرە کە جێگای شتی تریشی لەگەڵدایە، لای کەم با جێگەی کاغەزی سپیو پەڕە چاپکراوەکانو چاکتریش وایە جێگای هەڵگرتنی CD و ڕەفەیەکیش بۆ نامیلکەکانی کۆمپیوتەرەکەی لەگەڵدا بێت.

**١٥٩- هەڵگری ئەو پەڕەیەی کە چاپی دەکەیت:**

لە چاکترین ئەو پارچانەی کە لە نوسینگەدا سوودی لێوەردەگیرێت، ئەو هەڵگرەیە کە بە شێوەیەك دەبەسترێت لە ئامێری چاپ، یان شاشەی کۆمپیوتەرەکە دەتوانیت بە ئاسانی ئەو پەڕەیەی لەسەر جێگیر بکەیتو بەڕێکی ببینیت کە دەتەوێت نوسراوەکەی سەری چاپ بکەیت، ئەم هەڵگرانە ئێستا جۆری پێشکەوتوویان هەیەو جێگای زۆر کەم لەسەر مێزەکە داگیر دەکەن. چاکترین جۆری ئەم هەڵگرانە کە ئێستا هەن ئەوەیانە کە لە لاتەنیشتی سکرین، یان ئامێری چاپ دەبەسترێت، ئەم بەرهەمە خۆی بچوکەو ناوێکی دوورو درێژی هەیە کە بریتییە لە BCs “Robotic Arm” Universal Mini copy Holder ٢٠٠٠ وە جۆری تریشی هەیە، کە ئەوانیش خراپ نین وەك:
(SRW,Curtis Clip)

**١٦٠- ڕێکخستنی شتومەکی ناو نوسینگەو سەرمێز:**

لەگەڵ ئەو سیدیانەی کە دەیانکڕیت شوێنێك هەیە بۆ نووسینی ناونیشانی سیدییەکە، دەتوانیت ناواخنی سیدییەکەی لەسەر بنوسیت، دەتوانیت هەر کۆمەڵێك سیدی بە ڕەنگێکی تایبەت جیابکەیتەوە تا لەگەڵ ئەوانی تر تێکەڵ نەبن. ئەوسا ئەگەر ویستت بۆ نمونە سیدیەك دەربهێنیت کە بنەماکانی زانیاری لەسەر تۆمار کرابێت.

**١٦١- ڕێکخستنی شتومەکی ناو نوسینگەو سەرمێز:**

لەگەڵ ئەو سیدیانەی کە دەیانکڕیت لەزگەیەك هەیە بۆ نوسینی ناونیشانی سیدییەکە، دەتوانیت بەکاری بهێنیتو بیلکێنی بە سیدییەکەوە، پاش ئەوەی ناواخنی سیدییەکەی لەسەر دەنووسیت، دەتوانیت هەر کۆمەڵێك سیدی بە ڕەنگێکی تایبەت جیابکەیتەوە تا لەگەڵ ئەوانی تر تێکەڵ نەبن. ئەوسا ئەگەر ویستت بۆ نمونە سیدییەك دەربهێنیت کە بنەماکانی زانیاری لەسەر تۆمار کرابێت، ئەوا دەست دەبەیت بۆ ئەو سیدییانەی کە بە سەوز نیشانەت کردوون، چونکە ڕەنگی سەوزت بۆ ئەو کۆمەڵە سیدییە هەڵبژاردووە.

لەسەر هەر سیدییەك پێویستە زانیاری تەواو بنوسیتو پشت بە بیرو هۆشی خۆت نەبەستیت، بەمەش دەرباز دەبیت لە ونکردنو

پشتگوێ خستنی دۆسییە گەلێکی گرنگ کە ڕەنگە ڕووبدات بە هۆی لێکچوونی سیدییەکانەوە کە پێت وایە دێنەوە یادتو تێکەڵیان ناکەیت.

ناوی ئەو بەرنامەیە بنوسە کە لە بەرهەمهێنانی دۆسیەیەکدا بەکارت هێناوەو جۆری سیدییەکەو پاشان لە شوێنێکی پاکو دوور لە تەپو تۆز بیپارێزەو ئەوانەش کە زۆر بەکاریاندەهێنیت لە نزیک دەستت دایان بنێ.

١٦٢- سیدییەکانت پشتگوێ مەخە:

ناو بەناو پشکنین بۆ فلۆپییەکانت بکە، ئەویش بە ئۆردەر – فەرمانی dir/w -لای ئارسەر (تیر)ی دۆسەوە، ئەگەر ماکنتۆشت بەکاردەهێنا ئەوا فەرمانی Print Directory لە لیستیFile هەڵبژێرەو ئەم لیستە پرینت (چاپ) بکەو لە ناو پاکەتی سیدیەکەتدا دایبنێو لە کاتی پێویستدا بچۆرەوە سەری، هەروەها دەتوانی ئەم بەڵگانە (ڕێنماییانە) وێنە بگرین لەگەڵ نووسینی ژمارەی سیدییەکە لەبەردەم هەریەکەیانداو جێگیرکردنی لەسەر تابلۆی ئاگادارییەکان ئەمەش لە پێناو ئاسان دۆزینەوەی هەر دۆسیەیەك کە پێویست بێت.

١٦٣- ئاگاداری برانی لەپڕی تەزووی (کارەبا) بە:

ئەگەر خەمی زانیارییەکانی ناو کۆمپیوتەرەکەتەو ناتەوێ بە هەر هۆیەکەوە بێت لە دەستت بچن، ئەوا برانی لە پڕی تەزووی کارەبا دژوارترین هۆیە بۆ لەناوچوونی ئەو زانیاریانە. لە هۆیەکانی پچڕانی تەزووی کارەبا چاك پێوە نەکردنی پلاکو وایەرەکانە، یان بەستنیان بە هەڵەو یان چلکبوونی سەرە پلاکو ناو سویچەکانە. دەتوانرێت ڕێگری لە پچڕانی لە پڕی تەزوو بکرێت بە بەکارهێنانی وایەرو پلاکو سویچی توندو تۆڵ.

١٦٤- چەند لەبەرچاو گرتنی تایبەت بە کۆگای دۆسییەکان:

بۆ ئەو کەسانەی کە لە ناو کاغەزو دۆسیەکانیاندا نوقمبوون، کۆگا، یان چەکمەجەی هەڵگرتنی دۆسییە دەتوانێت ژیانیان بۆ بگێڕێتەوە، پێش ئەوەی بڕیاربدەیت پلاندابنێ، شوێنو شێوە مەبەستەکەت دیاری بکەیت، چەکمەجە بۆ هەڵگرتنی دۆسیە جۆری زۆرە، هەیانە بە پێوە دادەنرێت، هەشە ئاسۆییە، ئاسۆییەکان دۆسیە لە بەشی پێشەوەو بەرەو دواوە دادەنرێتو شێوەی سەرنجڕاکێشە، بەلام جێگای زۆر داگیردەکات، بەلام ئەوەی بە پێوە دادەنرێت دۆسییەکان تیایدا لە تەنیشت یەکەوە ڕیز دەکرێن، جۆری تریش هەن کە دۆسیەکانی تێدا هەڵدەواسرێت.

١٦٥- چەکمەجەی پاراستنی دۆسییە:

هەڵبژاردنی چەکمەجەی دۆسییە بنەمای خۆی هەیە، لەوانە: ژمارەی دۆسییەکان، فراوانی شوێنەکە، دەتەوێت دیارو بەرچاو بێت، یان شاراوە؟ نرخی کڕینەکەی... چەکمەجەکەش جۆری زۆرە لە یەکتر جیاوازن بە گوێرەی ژمارەی چەکمەجەکان –دوانی، سیانی، چواری،... بە پێوە بێ، یان ئاسۆیی؟ کلیلدار، یان بێ کلیل، شیشی هەڵواسینی دۆسیەی هەبێ، یان نا؟ لە ساج، یان تەختە، یان کانزا دروستکرابێت؟ مۆدێلی کۆن بێ، یان نوێ، پێش کڕینی گفتوگۆی تەواوی لەسەربکەو پاشان بیکڕەو لەسەر دۆسییەکانیش زانیاری تەواو بنوسە.

١٦٦- دۆسییەی هەڵواسراوی گەورە:

دۆسییەی هەڵواسراو چاکترین داهێنراوی بواری خۆیەتی بۆ پاراستنی فایلەکان، ئەم دۆسیانەش جیاوازن لە جۆرو ڕەنگدا، شوێنی تایبەتی هەیە بۆ نوسینی ناونیشانو زانیاری لەسەری، هەر کۆمپانیایەکی بەرهەمهێنی ئەمجۆرە دۆسیانە تایبەتمەندی خۆی هەیە، بۆ نمونە دۆسیەی xelfadneP، ڕێگە دەدات ناونیشانی دۆسییەکە بجوڵێنی لە دیوێکەوە بۆ دیوەکەی تر. ئەم دۆسیانە لە ناو چەکمەجەکاندا دەجوڵێن: (هاتووچۆ دەکەن)، بە ناو چەکمەجەکەداو لەم جوڵەیەشدا فورساییان دەکەوێتە سەردوو شت، یەکەم لاشانی چەکمەجەکەو دووەم خاڵی هەڵواسینی دۆسیەکە لەسەر هەردوو تەنیشتی چەکمەجەکە، کە ئەمەش ڕێگە دەدات بە نیمچە دەرهێنانی دۆسییەکە بەرەو سەرەوە بۆ دەرهێنان، یان دانانی پەڕەو نوسراوی نوێ تێیداو دواتر گێڕانەوەی بۆ شوێنی خۆی. بەلام کۆمپانیای lasrevinU sehtnA لەم جۆرە دۆسیانە بەرهەمدەهێنێت، کە ناونیشانکراون بە ژمارە، یان پیتی هیجائیو کۆمەڵەی پێکەوە لکاودا، - ئەمجۆرەیان هەرچەندە گۆڕینی گرانە، بەلام لەوانی تر هەرزانترەو بۆ بەکارهێنانی ناوماڵیش گونجاوە.

١٦٧- لەناو خانەو چەکمەجەکاندا:

دۆسیەکانت بە شێوەیەکی ساکار ڕێکبخە، دیزاینێك بکە کە پێویستت بە کەمترین دۆسیە بێت، گرنگ ئەوەیە بە جۆرێك ڕێکیان بخەیت کە لە کەمترین کاتدا بگەیتە ئەو پەڕەیەی کە دەتەوێت، ژمارەیەکی کەم پێت لە یەك دۆسیەی گەورەدا کۆبکەرەوە، ئەگەر دۆسیەیەکی گەورە قەبارەکەی زۆر زیادی کرد، ئەوا بیکە بە دوو بەشەوەو بەو جۆرە، هەندێ بابەت هەیە کە دەبێ بۆ هەریەکەیان دۆسیەیەکی تایبەت دابنرێت وەك: ئۆتۆمبیل، بانك، ئەو وصلانەی کە پێویستە پارەکانیان بدرێت، نامە گۆڕینەوە(دەرچوو)، هاتوو، بەڵگەنامەو گەواهینامە، دیکۆمێنتی یاسایی، فێرکردن، ئیشو کاری خانووبەرە، ئیشو کاری دارایی، ئیشو کاری تەندروستی، بیمە، باج، تەلەفۆن،....

١٦٨- دۆسیەی بازنەیی: پێش ئەوەی بڕیاربدەیت کە لە کام دۆسیەدا بیانپارێزیت، بڕیار بدە ئایا ئەم پەڕانە پێویستە هەڵگیرێن! خاتوو باربارا همفیل پسپۆر لە بواری ڕێکخستنداو دانەری کتێبی (دەستەمۆکردنی پڵنگی کاغەزی)و (setaicossa llihpmeh) دەڵێت: «لە سەدا هەشتای ئەو پەڕانەی کە لە دۆسیەی کەسەکاندا پارێزراوە، هەرگیز بەکارناهێنرێن» ئەو خاتونە ئامۆژگاری ئەوەمان دەکات کە ناکرێت لەبەردەم دۆسیەیەکدا دانیشیتو دۆسیەیەکی بازنەیی (تەنەکەی خۆڵ) لای خۆت دانەنێیت، پێش ئەوەی هەر پەڕە کاغەزێك بخەیتە ناو دۆسیەیەکەوە لە خۆت بپرسە: ئایا ناواخنی ئەم پەڕەیە سودێکی هەیە، ئایا پێویستە بەرواری بخرێتە سەرو هەڵگیرێت؟ ئەگەر ئەم پەڕە کاغەزە فڕێ بدەیت چی ڕوودەدات؟! ئەگەر وەڵامەکانت ((نەخێرو نەخێرو هیچ)) بوون، ئەوا ڕەوانەی دۆسییەی بازنەیی بکە.

١٦٩- شێوازی من لە پاراستنی دۆسییەدا:

پێویستە ئەو شێوازەی بەکاریدەهێنیت بۆ پاراستنی دۆسییەکانت مانادارو گونجاوبێت بۆ خۆتو خەڵکانێکی تریش، کە ئەو دۆسیانە بەکاردەهێنن. ئەگەر سیستەمی ڕێکخستنەکەت زۆر نایاب بوو، بەلام ئەوەندە ئاڵۆزت کردبوو کە نەتوانی بە ئاسانی بۆ دۆسیەیەك بگەڕێیت، یان ئەوەندە ساکار بوو کە نەتوانی دۆسییەکان بە وردی پۆلێن بکەیت، ئەوا ئەو دوو سیستەمە هەردووکیان نەگونجاوو سەرنەکەوتوون، جا بۆئەوەی شێوازەکەت تاقیبکەیتەوە ئەوا: بزانە بە چ خێراییەك دەتوانیت دەستبخەیتە سەر ئەو پەڕەیەی کە هەرمەکی هەڵیدەبژێریت.

١٧٠- کاتێك دەکەویتە (حیرە):

ئەگەر لەو کەسانە بوویت کە خولیای کۆکردنەوەی هەموو نوسراوێکت هەبوو، ئەوا دوو دۆسیە ئامادە بکە، لەسەر یەکەمیان بنوسە "بۆ پاراستن"و دووەمیشیان "فڕێدراو – پشتگوێخراو(مهملات)" دۆسیەی یەکەم بۆ ئەو پەڕەو نوسراوانە دابنێ کە نیازی پاراستنیان هەیە دوای نوسینی ناوی دۆسیەکە لەسەر هەریەك لەو پەڕانە، بۆ ئەوەی لە کاتی دانانی لە مەلەفەکەدا ناچاری دووبارە خوێندنەوەی نەبیت، بەلام دۆسیەی دووەم دابەشبکە بە چەند دۆسیەیەکی بچوکترەوەو لەسەر هەریەکەیان ناوی مانگێك بنووسەو تایبەتی بکە بە بابەتی گشتی وەك: نمایشی شمەكو فرۆشتنو ڕاگەیەنراوە ڕۆژنامەییەکان، ئەوانەی کە لە کۆتایی مانگدا بەسەردەچن، لە کۆتایی هەرمانگێکدا پەڕەو نوسراوەکانت بپشکنەو ئەگەر ئەوەندە ئازابوویت، ئەوا بێ سەیرکردنیان خۆتیان لێ ڕزگاربکە.

١٧١- دەرزی دەبوس بەکاربهێنە، نەك تەلی ئالێنراو:

بۆ یەکخستنی دیکۆمێنتەکان لە دۆسیەیەکدا خۆ لە بەکارهێنانی تەلی ئالێنراو بپارێزە، چونکە شوێنێکی زۆر لە دۆسیەکەدا داگیردەکاتو دیمەنیشی جوان نییە، ڕەنگە پەڕەی تری تێ بئاڵێو کێشەت بۆ دروست بکات، لەبری ئەمە دەتوانی پەڕەکان بە ئامێری تایبەت کون بکەیتو بە تاڵێك بەن، بیانبەستی بە یەکەوە، یان دەرزی دەبوس بەکاربهێنیت.

سەرکەوت هەڵەبجەیی



# پەیامێك بۆ بەڕێوەبەرە کارگێڕییەکان!

بەڕێوەبەری کارگێڕی لە هەر دامو دەزگاو کۆمپانیایەك گرنگییەکی ئەو تۆی خۆی هەیەو بڕبڕەی پشتی ئەو دامەزراوەیە، کە لە زۆر دامو دەزگاکاندا بریتییە لە بەڕێوەبەری (کارگێڕیو دارایی)، یان بەڕێوەبەری (کارگێڕیو کاروباری کۆمپانیا)، ئەو جۆرە بەڕێوبەرە سەهەم بەدەستی دامەزراوەکەیە، بەشێوەیەك لایەنێکی زۆری پێشکەوتنو کەمو کوڕی کۆمپانیا پەیوەستە بەو جۆرە بەڕێوبەرەوە.

بوونی بەڕێوەبەرێکی وەها گرنگییەکی زۆری هەبێت، بێگومان پەیامی زۆریشی لەسەر هەیە، بەڵام من لێرەدا ڕووی پەیامەکەم دەکەمە لایەنی هەڵسوکەوتی بەڕێوەبەری لەگەڵ کارمەندەکانی کۆمپانیا، یان دامو دەزگاکان لە ژیانی کارگێڕیدا لە ڕاییکردنی کاری دامەزراوە، یان کۆمپانیادا، زۆرجار بەڕێوبەرەکان سروشتێکی سەرکەوتوو بەخۆیانەوە نابینن لە ڕازیکردنی کارمەندانو هاندانی کارمەندانو بردنەسەری بەڵێنەکان بە کارمەندان، جا لە هەر لایەنێکی کارەکانی بێت، بەڕێوەبەر زۆر گرنگە لە خودی کامەرند تێبگاتو ببێتە مەرامی کێشەکانی کارمەند، بەشێوەیەك لە کێشەو داواکارییەکانی کارمەندەکان بگات، لە یەکە یەکەی کارمەندەکان، ئاخۆ زۆرجار داواکارییەکی سادەی بێ زەرەرو زیانی کارمەندێك ناکرێت فەرامۆش بکرێو بگاتە ڕادەی جێهێشتنی پیشەکە لەلایەن کارمەندەکەوە.

دەستکەوتنو دروستکردنی کارمەندی لێهاتوو کارێکی ئاسان نییە، کە زۆر جار بەڕێوبەرەکان دروستی دەکەنو دواتریش بە ئاسانی لە دەستی دەدەن، جۆری کار چەند گرنگی هەیە، جۆری کارمەندیش زۆر زیاتر لەمە گرنگی خۆی هەیە، کارمەندەکان داوایەك لە بەڕێوبەر دەکەن، بۆ بەردەوامبوونی کارەکەیان، ناکرێت بەڕێوەبەر بێ تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی باسەکە داواکە ڕەت بکاتەوە، یان تەنیا لە ڕوانگەیەکەوە بڕوانێ، لەوانەیە ئەگەر کارمەندێك داوای زیادکردنی بڕێك لە موچەکەی بکات لەبەرامبەر جێنەهێشتنی کارەکەی، ڕاستەوخۆ بەڕێوبەرەکە داواکەی پەسەند نەکات تا سەرەنجام ببێتە ترازانی کارمەند لە کارەکەی، ڕاستە بەڕێوەبەر ڕەچاوی ئەوە دەکات کە موچە زیاد بکات لەو مانگە بەدواوە، کۆمپانیا (....)، پارە دەبێ زیاتر بداتە کارەکە، بەڵام ئەگەر کارمەندەکە شیاوی کارەکە بوو، لێهاتوو بوو لە کارەکە دڵنیابە دەبێتە هۆی بەدەستهێنانەوەی لایەنی ماددیی.

داواکاری موچەو پارە گریمانەیەکە، لەوانەیە کارمەند هەبێت داوای گۆڕینی کەلوپەلێکی کارەکەی بکات، یان داوای جۆرە هەڵسوکەوتێك بکات، یان داوای کەمکردنەوەی بڕێکی کاتی دەوامەکەی بکات، یان گۆڕانی کاتەکە، یان داوای پۆستێکی تر بکات، بێگومان بەڕێوەبەری سەرنەکەوتوو لەو حاڵەتەدا زۆر بە سادە بیر دەکاتەوەو یەکسەر وشەی نەخێر دەردەبڕێو داواکە جێبەجێ ناکات، یان دەبینین زۆر بەڕێوەبەری لەو حاڵەتە وشەی "بەڵێ" دەردەبڕن، بەڵام جێبەجێی ناکەن، بڕیاربە کارمەندەکە دەدەن ئەو کەلو پەلەی داوای کردووە بۆ دەستەبەر بکات، یان پۆستی داواکراوی بۆ فەراهەم بکات، بەڵێن دەدەن کە کاتی دەوامەکەی بۆ بگۆڕێ، بەڵام جێبەجێی ناکات، ئەوەش لەهەمان کاتدا دەچێتەوە بابی جێبەجێ نەکردنەوە، تا سەرەنجام کارمەندەکە لە کارەکەی دەترازێت، چونکە زۆر چاوەڕێی جێبەجێکردنی داواکەی بوو، بەڵام داواکەی جێبەجێ نەکرا.

بەڕێوەبەری سەرکەوتووش هەیە کە زۆر چاك کارمەندەکانی خۆی ئەناسێ، دەزانێ کە لە دەستدانی کارمەندی وەها زەرەری پێ دەگەیەنێ لە هەڵسوکەوتی نێو کۆمپانیاو باری دارایی کۆمپانیا، بۆیە قبوڵ ناکات لەپێناو داواکارییەكو دوو داواکاری، کارمەندەکانی وەها لەدەست بدات.

# پڵنگ و تیمساح!



و: محەممەد مێرگەیی

ڕۆژێـــك لە ڕۆژە گەرمەکان، تیمســاحێك بڕیاریدا بچێتە ڕاوکردن لە دووری ئەو ڕووبارەی تیایدا دەژیا، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو زۆر دوورکەوتەوە لــە شــوێنی خۆی، ڕێــگای گەڕانەوەی لــێ ونبوو. تیمســاحەکە کە زانی ڕێگاکەی ونکردووە لەبەرخۆیەوە دەیگوت، ئەمڕۆ ڕۆژێکی ناخۆشــە! ئای چۆن بەمشێوەیە لە ڕووبارەکە دوورکەوتمەوەو ڕێگای گەڕانەوەم بزرکرد؟

ئــەو هەر لە قســەکانی بــەردەوامو دەیگــوت: ئەگــەر وەها بڕوات بەبێگومــان هەر لە تینوویتیدا دەخنکێم، دوای ئەوە کەوتە هاوارکردنو داوای یارمەتی دەکرد: تکایە یارمەتیم بدەن، تینوومەو ئاوم دەوێت.

لەولاوەو لــە پەنــای دارودرەختەکانەوە، ئاژەڵەکانی وەکو ئاســكو کەرەکێویو کەرکەدەن گوێیان لە هاتو هاواری تیمساحەکە بوو، ئەوانیش لەبەر خۆیانەوە دەیانگوت: ئەی دڕندە.. ئەمە پاداشــتی خراپەی خۆتە، چەندین بێچووی ئێمەت خواردووە! با ئیتر وات بەسەربێتو لەناوبچیت.

دوای کەمێك پڵنگێك لە تیمســاحەکە نزیکبووەوەو پێی گوت: هێی تیمساح ئەوە لێرە لە خاکی ئێمەدا، چی دەکەیت؟

تیمســاحەکە گوتی: تکایە هاوڕێ، ئایا دەتوانیــت یارمەتیم بدەیت بگەڕێمــەوە بــۆ ناو ڕووبارەکە؟ مــن ڕێگام ونکــردووە، هەروەها لەبەر گەرمای زۆر هێزو تینم لێبڕاوە، بۆیە ناتوانم چیتر لەسەر پێ بڕۆم!

پڵنگەکە گوتی: تیمساح فێڵو تەڵەکەبازیی تۆ دیارو ئاشکرایە!

تیمساحەکە گوتی: چی؟ من؟

پڵنگەکە گوتی: بەڵێ تۆ! کێ دەڵێت کە دوای ئەوەی یارمەتیم دایتو تۆم گەیاندەوە ڕووبارەکە، تۆ پەلامارم نادەیت؟

تیمســاحەکە گوتــی: هاوڕێ، ســوێندت بۆ دەخۆم لەبەردەم گشــت ئاژەڵەکانی دارستان کە من پەلامارت نادەم!

پڵنگەکە گوتی: ئەی چۆنو بە چی سوپاسم دەکەیت؟

تیمســاحەکە گوتی: ماســی زۆرت بــۆ ڕاودەکەم، کە بەشــی یەك مانگی تەواوت بکات، هەروەها دەبیتە هاوڕێی نزیکی من! ڕات چییە لەبارەی ئەمەوە؟

پڵنگەکە گوتی: باشە! من بەوە ڕازیم!

دواتر پڵنگەکە دەستو پێیەکانی تیمساحەکەی بەستو تیمساحەکەی خستە سەر پشتی، بۆئەوەی بە پشتی هەڵیبگرێت بەرەو لای ڕووبارەکە.

ئاژەڵــەکان کە لــە دوورەوە ئــەم دیمەنەیــان دەدیــت، دەیانگوت: هاوڕێیان چارەنووسی ئەم پڵنگە لە مەترسیدایە! ئاسك دەیگوت: هەرگیز نەمدەزانی پڵنگ تا ئەو ئەندازەیە دڵپاکە!

پڵنگەکە تیمساحی گەیاندەوە لێواری ڕووبارەکە، ئینجا لەسەر پشتی هێنایە خوارەوەو پێی گوت: ئەوە تۆم گەیاندەوە ڕووبارەکە.

تیمساحەکە گوتی: هاوڕێ ئەی پەتی دەستو پێیەکانم ناکەیتەوە؟

پاش ئەوەی پڵنگ پەتەکانی کردەوە..

تیمســاحەکە گوتی: هاوڕێ من ئەوەندە مانــدووم تەنانەت ناتوانم هەنگاوێــك بــەرەو کەنارەکــەش بچمە پێشــەوە! بۆیــە یارمەتیم بدە بۆئەوەی بگەمە ئاوەکە! تکایە لە دوایین ساتدا بەجێم مەهێڵە.

پڵنگەکــە یارمەتــی تیمســاحەکەی دا، تاکــو گەیشــتە نــاو ئــاوی ڕووبــارەوە، هەر ئەوەندەی کە تیمســاحەکە دڵنیابــوو لەوەی پڵنگ بە تەواوی گەیشــتۆتە ناو ئاوەکەوە، یەکسەر بە ناو لەپی دەستێکی یەکێك لە گوێیەکانی پڵنگی بە توندی گرت.

پڵنگەکە گوتی: ئاخخخ.. گوێچکەم، ...ئەوە چی دەکەیت؟

تیمساحەکە پێکەنیو گوتی: هاوڕێی خۆشەویستم بە ڕای تۆ دەبێت چی بکەم؟

بــە کورتی ئەمڕۆ تۆ دەبیتە ژەمــە خۆراکی من! چی دەڵێیت؟ بەو شێوەیە بەخێرایی هەموو ئەو هێزەی لە دەستم داوە بۆم دەگەڕێتەوە.

پڵنگەکــە گوتی: بەڵام تۆ بەڵێنت پێدام، کە ئەگەر من ژیانی تۆ لە مردن ڕزگاربکەم ئەوا دەبینە هاوڕێ!

تیمساحەکە گوتی: ئەوا ئێستا بەڵێنەکەمم شکاند!

هــەر لــەو کاتەدا کەروێشــکێك بــۆ ئاوخواردنەوە لــەوێ پەیدابوو. کەروێشکەکە کە ئەوانی دیت گوتی: ئەم دیمەنە چەند نامۆیە! ئەوە چۆن ئەم پڵنگە چۆتە ناو ئاو، تاکو تیمساح بەمشێوەیە بە گوێچکەی بگرێت؟

کەروێشکەکە گوتی: هاوڕێیان ئەوە چی دەکەن لەناو ئاودا؟

پڵنگەکە تەواوی چیرۆکەکەی بۆ کەروێشکەکە گێڕایەوە، ئینجا پێی گوت: کەروێشکی ژیرو دانا بەڕای تۆ من شایەنی ئەوەم، لە بەرامبەر ئەو کاری چاکەو یارمەتییەم بۆ ئەم تیمساحە؟

کەروێشــك گوتــی: بــا بزانم، بــەڵام ئێمــە ناتوانین بەمشــێوەیە قســەبکەین! ســەرەتا لەناو ئاوەکــە وەرنە دەرەوە، بۆ ئەوەی بە باشــی گفتوگۆ بکەینو لە نزیکەوە گوێتان لێبگرم.

پــاش ئــەوەی ئەوان لــە ئاوەکــەوە هاتنــە دەرەوە، کەروێشــك لە قسەکردن بەردەوام بوو گوتی: باشە! شتێك هەیە کە سەرم سوڕماوە لێی! تیمساحەکە ئایە ڕاستە پڵنگ توانی لەسەر پشتی خۆی هەڵت بگرێت؟

تیمساحەکە:بەڵێ، بەڵام دوای ئەوەی کە دەستو پێیەکانمی بەستەوە!

کەروێشکەکە گوتی: ئۆهـ.. ئاخر من باوەڕ بەوە ناکەم، باوەڕناکەم!

تیمساح گوتی: بەڵام من ڕاستییەکە دەڵێم! ڕاستییەکەی بەوشێوەیە بوو.

کەروێشکەکە گوتی: ئاخر دەبێت من بە چاوی خۆم ئەوە ببینم، بۆ ئەوەی بە باشی بزانم چی ڕوویداوەو ئینجا کە باوەڕم کرد ئەوا بیروڕای خۆمتان پێدەڵێم.

ئیتــر ئەوەبوو پڵنگەکە دووبارە دەســتو پێیەکانی تیمســاحەکەی بەستەوەو خستییەوە سەر پشتی خۆی.

تیمساحەکە گوتی: کەروێشك ئێستا چی دەڵێیت؟ ئایە باوەڕت کرد؟!

کەروێشك: ئۆهـ..، بەڵێ... بەڵام تۆ ئەی پڵنگ ئێستا پیشانم بدە کە دەتوانیت ئەم ماوە دوورە ببڕیتو تیمساحەکەش لەسەر پشتت بێت!

پڵنگ گوتی:مەبەستت ئەوەیە بگەڕێمەوە ئەو شوێنەی تیمساحەکەم هێناوە؟

کەروێشك گوتی: بەڵێ! ئەگەر لاریت نەبێت لەسەر ئەوە؟ بەمجۆرە پڵنگەکە تیمساحی بەسەر پشتییەوە بردەوە هەمان ئەو شوێنەی لێیەوە هێنابووی.

کاتێــك ئاژەڵەکانی ناو دارودرەختەکان بەمەیانزانی، دەیانگوت: ئەوە چی ڕوودەدات، پلانێك هەیە! بزانین چی دەبێت. کەروێشك بە پڵنگەکەی گوت: بەیارمەتیت دەستو پێیەکانی تیمساحەکە بکەرەوە، ئەویش ئەمەی کرد! تیمساحەکە گوتی: کەروێشك ئێستا ڕای خۆتمان پێ بڵێ.

کەروێشــکەکە گوتــی: ڕای من ئەوەیە کە تۆ ئەی تیمســاح فێڵبازو تەڵەکەبــاز، ئــەی تۆ بەڵێنت بە پڵنــگ نەدابوو ببیتە هاوڕێو بەشــی مانگێك ماسی بۆ بگریت؟

کەروێشــكو پڵنگ لــە تیمســاحەکە دوورکەوتنــەوەو پێیان گوت: تیمســاحی فێڵبازو چڵکن، ئێستا خۆت هەوڵدە ڕێگەیەکی تر بدۆزیتەوە بۆ ناو ڕووبارەکە.

لە کۆتاییدا تیمســاحەکە دووبــارە کەوتە هــاتو هاوارکردنو هەر دەیگوت: نا نا تکایە بەجێم مەهێڵن لە تینوویەتیدا بمرم!

ئاژەڵەکانی ناو دارو درەختەکان بەمە زۆر خۆشــحاڵبوون، ئەوانیش دەیانگوت: ئەوەی چاڵ بۆ براکەی هەڵکەنێت، خۆی تێی دەکەوێت!

سەرچاوە: کتاب العربی الصغیر ٢٣٣ - ٢٠١٢





# خولی ڕێنمایی بۆ خوێندکارانی «١٢»ی ئامادەیی، لە گۆڤاری بڕیار پێدەنێتە ساڵی دووەمەوە...

ئا: یەحیا محەممەد

دوای تەواوبوونی ساڵی یەکەمی «خولی ڕێنمایی» خولەکەمان دەرگای والآیە بۆ وەرگرتنی خوێندکاران بۆ ساڵی دووەم، هەربۆیە پێمانخۆشبوو لەو بارەیەوە چەندخاڵێك بخەینەڕوو:

**لە ڕووی کارگێڕییەوە:**

* گوشراوی ناوازەترینو نوێترین سەرچاوە زانستیەکانی جیهان، گونجاندنی لەگەڵ کۆمەڵگەماندا.

* بەکارهێنانی شێوازێکی سەردەمیانە، ئاسان بۆ تێگەیشتنو پراکتیزەکردن، ڕاهێنان نەك تەنها فێرکردن، توانای گۆڕانکاریو گەیشتن بە سەرکەوتن بە درێژایی ژیان.

* بەدەستهێنانی نمرەی بەرزو گەیشتن بە ئامانج.

* وتنەوەی لە لایەن خوێندکارانی کۆلێژە بەرزەکانەوە، کە ماوەیەکی کەمە پۆلی (١٢)یان بەجێهێشتووەو خۆشیو ناخۆشییەکانی قۆناغەکەیان لەیاد نەکردووە، «ئەمەش یەکێك بووە لە گەورەترین هۆکارەکانی سەرکەوتنی خولەکە».

* پرسو ڕاوێژی بەردەوام بە کەسانی خاوەن ئەزموونو پسپۆڕانی پەروەردەییو دەروونیو زانستیو گەشەپێدانی مرۆیی.

* بەشداری پێکردنی کەسانێك کە کاریان بەو شێوازانە کردووەو نمونەیەکی بەرزی سەرکەوتوو بوونی کارەکەن.

* گرتنەبەری شێوازێك کە پشوو بە دەروونو مێشکی بەشداربووان ببەخشێت، وەك (video، چیرۆك، بەسەرهاتی خۆش، ...).

* بوونی پەیوەندییەکی پتەو لەگەڵ خێزانی خوێندکاران.

* وەرگرتنی ژمارەیەکی دیاریکراو، تاکو زۆرترین گرنگیان پێبدرێت، نەك زۆرو کەم بایەخ!

* ساڵی یەکەم خولەکەمان ٧٥ کاتژمێر بووە.

**ڕای ئەو کەسانەی خولەکەیان بینیوە:**

بەشداربووانی ساڵی یەکەم (٢٠١١ – ٢٠١٢):

ئەمە چەند وتەیەکە لەو چەندان وتانەی خوێندکارانی "١٢ای ئامادەیی" کە لە نوسراوێکدا بە بێ نوسینی ناوی خۆیان لە کۆتایی وانەکاندا بە خولەکەیان وتووە:

- بە شێوازێك پۆلی ١٢ ناسێنرا، دەڵێی خۆی هاتووەتە زمان، نەخشەیەکمان لەبەرچاودایە بە هەموو نهێنییەکانی پۆلی ١٢ای ئاشناکردووین.

- زمانم نازانێت چی بڵێ، قەڵەمیش هیچ نانوسێت، بۆیە بێدەنگ دەبم.

- ئەم خولە لە هەموو لایەکی ژیانەوە هەستو نەستی گۆڕیم.

-هەمیشەو بەردەوام سوپاسی خودا دەکەم، کە خولێکی ئاوای پێناساندم.

- کەسێك نەزانێت دەڵێ: ئەم خولە لە لایەن ڕێکخراوێکی زۆر گەورەوە بەڕێوەدەچێت، ئەگەرنا چۆن دەکرێت ئاوا سەرکەوتوو بێت؟!

- بە ڕاستی لەم خولە زانیم، من کێمو خۆم دۆزییەوە...

- من زۆر لە خوێندکارانی دیکە جیاوازم، بە بوونم لەم خوولە...

- ئەگەر ئەم خوولە نەبوایە، چەندە ماندوو دەبوین؟!

- بە شێوازێك فێری بەرنامەدانانو چارەسەری کێشەکانم بووم، بۆ هەموو ژیانم کەسم ناوێت.

- ئەمە وتەی هەموو خوێندکارانە: هەرگیز وانەزانراوە ئێمە خوێندکارین، ڕاهێنەریش مامۆستایە، هاوڕێ، نەخێر بەڵکو ئەندامانی یەك خێزان.

- لەو باوەڕەدانیم کەسێك بەشداری ئەم خولەی کردبێت، بە درێژایی ژیانی بۆ جارێکیش ڕەشبینی ڕووی تێبکات.

- لەم خولەوە فێری یارمەتیدانی هەموو خەڵك بووم، ئێستا من بە ڕووح دەژیم نەك بە ماددە!!

-"عاشقی پرۆگرامو خوێندنگاو کتێبم"، ئای لە ڕابردوودا چەند ڕقم لێیان بوو!!

- ئەگەر نمرە نەهێنین، ئەوا تاوانی خۆمانەو کەمتەرخەمی خولەکە نەبووە.

- لەم خولەدا گەورەترین سوودم بینی، ئەویش (ناسینی پەروەدگار)، فێربووم چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەم.

- لەم خولەدا فێربووم گەورەترین ڕێگای سەرکەوتن پەیوەندیمانە بە خوداوەو پشتبەستن بە خوداش گەورەترین هێزمانە.

- ناخۆشترین کاتم ئەو کاتەیە قاچم دەچێتە ئەودیو هۆڵی خولەکە!

- توخوا وانەی داهاتوو وەرەوە، چرکە چرکە ساتەژمێرم، فرمێسکی چاوم وشکبوو!!

- زۆرێك لە مامۆستاو کەسوکارو هاوڕێیانم دەیانگوت: چۆن دەکرێت پاش ماوەیەکی کەمو هەر لە سەرەتای بەشداربوونتەوە، ئەو هەموو گۆڕانکارییەت بەسەردابێت؟!

- ئەوەی لەم خوولە فێری بووم، زۆر زیاترە لەوەی بە درێژایی "١٨ ساڵی تەمەنم" فێربووم.

- کاتێك دەڵێن ساڵی داهاتوو داهێنانو بەرەو پێشبردنێکی زۆر لە خولەکەدا دەکرێت، بەلامەوە زۆر سەیرە! باشە دەبێت چۆن پێشبخرێت، ئایا لەمەش جوانترو نوێترو باشتر هەیە؟!

**میوانانی خولەکە:**

لە زۆربەی وانەکاندا کەسانێکی خاوەن ئەزموونو خوێندکارانی کۆلێژە بەرزەکان، وەك میوان پێشوازیمان لێکردوون، تاکو ڕای خۆیانمان پێ بڵێن:

- لەو باوەڕەدا نیم لە کوردستاندا هیچ خولێکی گەشەپێدانی مرۆیی، ئاوا سەرکەوتوو کرابێتەوە!!

- ئەم خولە زۆر لەوە لە پێشترە بۆ پۆلی ١٢ بەکاربێت، تکایە بۆ ئاستی بەرزتری بکەنەوە!!!

- مامۆستایەك، دوای تەمەنێکی زۆر مامۆستایەتی: ئێوە چیتان کردووە، کە ئاوا سەرنجی خوێندکارەکانتان ڕاکێشاوە؟! تکایە خولێك بکەنەوە بۆ مامۆستایان، دەربارەی چۆنییەتی وانەوتنەوە.

- ئەوەی ڕاهێنەری ئەم خولە ببینێت، دەزانێت کە ڕاهێنەر چەندە شەیدای ئەو کارەیە!

سەرپەرشتیارو ڕاهێنەری خولەکە:

تەنها دەڵێین: بەسە بۆ ئەم خولە کە پەروەردەو نازپێدراوی گۆڤاری بڕیار بێت!



# خولی ڕێنمایی



## شێوازی خوێندن بۆ پۆلی (١٢)

لەگەڵ بڕیاردا تۆ هەمیشە لە پێشەوەی کارواندای!
لە نوێترین خولی فێربوونو ڕاهێناندا
لە ناوازەترین ئەزموونی کاریگەردا..
لە باشترین شێوازەکانی خوێندندا..
بۆ چۆنێتی خوێندنو بە دەستهێنانی نمرەی بەرز
لە خولی خوێندکارانی بە تواناداا بەشداری بکە

- مامۆستایانی شارەزاو بە ئەزموون
- خولی تایبەت بە (کوڕانو کچان)
- بەکارهێنانی نوێترین شێوازی جیهانی
- لەگەڵ بڕیاردا هەمیشە بەرەو لوتکە، هەنگاو دەنێیت، تەنها بە نامەیەکی (S.M.S)

ناوی سیانیو ناوی قوتابخانەکەت بۆ ئەم ژمارەیە بنێرە (07714690100) پەلە بکە،
ژمارەی کورسییەکان دیاریکراون..
ژمارەیەکی دیاریکراو دوای چاوپێکەوتنو هەڵبژاردن..

## مەرجەکانی وەرگرتن:

١- کەسی بەشدار بوو، دەبێت بەرواری لە دایکبوونی لەسەروو (١٩٩٣)وە بێت..
٢- لە پۆلی یانزە یەك ساڵە بێتو کۆی نمرەکانی ٧٠٪ کەمتر نەبێت.
٣- دووساڵە دەبێت داخڵ کرابێتو لە تاقیکردنەوە گشتییەکاندا هیچ وانەیەکی لە ٧٥٪ کەمتر نەبێت.
٤- بۆ هەر بەشداربوویەك بڕی (٧٥٠٠٠) حەفتاو پێنج هەزار دینار وەردەگیرێت.
٥- چاوپێکەوتن لە بەرواری ٢٠١٢/٧/٦ کاتژمێر (٢) پاش نیوەڕۆ دەست پێدەکاتو یەکەم وانەی خولەکە لە ٢٠١٢/٧/١٣ بە پشتیوانی خودا دەست پێدەکات..
٦- دوامۆڵەت بۆ ناونووسین ٢٠١٢/٧/١..





# یاساکانی بازاڕسازی

بەشی دووەمو کۆتایی

ن: د. ئیبراهیم فەقێ. و: وەهاب حەسیب

### ٤. ڕێسای هاوبەندی ـ وابەستە:

ئەوەیە کە کەسانێك وابەستەی ناوی کەسانی گەورەو سەرکەوتوو بکرێنو پاڵپشتیان بنو سەرکەون لەگەڵیاندا، من بە بەردەوامی دەئاخفم لەسەر کەسایەتییە بەهێزەکان، لەوانە شێخ متوەلی شەعراوی، (د. ڕۆبرت شۆلر) ئەم پیاوە مەردە بچێتە هەر جێگایەك ئەوا (٣٠ ٠٠٠) تا (١٠٠٠٠٠)کەس ئامادە دەبن، کاتێك وابەستەی دەبیت بەشێوەیەك کە ئەو مامۆستایەو تۆش قوتابیو هاوبەندییەکی ئەرێنی لەگەڵ سەرکردەدا دروستدەکەیت.

### ٥. ڕێسای سەرکەوتن:

لەوانەیە سەرکەوتن گەورەترین هۆکاری تێکشان بێت هۆکارچییە؟

هۆکار ئەوەیە سەرکەوتنی یەکێك، یان ناوی کۆمپانیایەك دادەنرێت کە ئەوناوە، یاخود ناوی کۆمپانیاکە سەرکەتووە، هەرشمەکێك بە ناویەوە بێت، یان بە ناوی کۆمپانیاکە بێت، ئەوا سەرکەوتوو دەبێت، بە هۆی ئەو ناوەوە، ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە لە بازاڕسازیدا، بۆیە لەوانەیە سەرکەوتن گەورەترین هۆکاری ڕووخان بێت.

### هۆکاری ڕووخانی کەسی سەرکەوتوو؟

أ. دووری لە خوداوە: -پاکو بێگەردی بۆ ئەوە- ئەوەت لەبیر بچێتەوە کە پەروەردگار هۆکارە لەپشت هەر سەرکەوتنو بڵندییەکەوە.

ب. باوەڕی نەرێنی:

باوەڕت وابێت کە لە شتێکدا سەرکەوتویت لەوانەیە بە هەمان ئاستو پێوانەو هێز، لە کارێکی دیکەدا باڵادەست بیت، ئەمە هەڵەیەو خەونە، چونکە ئەگەر چویتە ناو شتێکی تازەوە، یان شمەکێکی نوێ تێدەگەیت کە ئەو شتانە سەرکردەیان هەیە، گروپی تایبەت بە خۆیان هەیە، کەسانی بە ئەزموونییان هەیە، (مخضرم): ئەو کەسەیە دوو دەورانی دیوە، وەك دەورانی نەفامیو ئیسلام، یان حوکمی پاشایەتیو پاشان کۆماری لە وڵاتێکدا. (وەرگێڕ). دواتر هیچ پێوەرێکی سەرکەوتن نییە لە هیچ شتێکدا تا لە شتێکی کەدا سەرکەوتووبیت.

### ج. یاسای لە خۆبایبوون:

کۆمپانیای (Ibm) باجی ئەم لە خۆبایبوونەییدا، کاتێك وتی: ئێمە یەکەم کەس بووین کە ئامێری کۆمپیوتەرمان لە جیهاندا دروستکرد، کاتێك کۆمپانیای (Apple) دەرکەوت (٣٢٪) یان وەرگرت، هۆکارەکەش ئەوە بوو کە بەرهەمەکانیان سادەبوو، تەنها بە گەیاندنی گەیەنەرێکی ئەلەتریك ئامێرەکە دادەگیرسا، هەرکەسێك بەدوای خێراییدا دەگەڕا، بەپەلە ڕوویدەکردە کۆمپانیای ناوبراو.

### ٦. یاسای ژمارە:

ئەوەی باوە کە چاوو دەمەکان دەگۆڕێن، بەڵام ژمارەکان گۆڕانیان بەسەردا نایات، ئەگەر لە بازاڕسازیدا پلانت وابوو بگەیت بە (٥٠٠٠) کەس، شایەد تۆ تەنها سەد کەسیان بناسیت، لەو بوارەدا لەوانەیە نیوەی ئەو ژمارەیە گۆڕانیان بەسەردا بێت، بەڵام ژمارەکە جێگیرە، تۆ مەبەستە شمەکو خزمەتگوزارییەکانت بگەیەنیت بە پێنج هەزارکەس، دەبێت پێیان بگات، فرۆشتنیش بەهەمان شێوەیە. ئەمڕۆ پلانت دارشتوەو گەرەکتە چاوت بە دەکەس بکەوێت، مەڵێ: تەنها لە تواناد هەیە دووکەسیان ببینم، چون ئەگەر چاوت بە(٣)کەسیان کەوت، لەوانەیە هیچ نەفرۆشیت، بەڵام ئەگەر دیدەنی لەگەڵ (١٠) کەس بەئەنجام بگەیەنیت، لەوانەیە بەلای کەمەوە یەکێکیان کڕیارت بێت، گەر خۆت بگەیەنیت بە سەد کڕیار، ئەوا لە توانادا دەبێت (١٠) کەسیان، یاخود بەلای کەمەوە (٥) کەسیان کڕیارت بن. لە بازاڕسازیدا ژمارەکان ناگۆڕێن، بەڵکو چاوو دەمەکانن گۆڕانیان بەسەردادێت، هەرچی ژمارەکانە جێگیرن.

# گەشەپێدان

هەر چوار ژمارەی گۆڤاری بڕیار

(١-٢-٣-٤)

لە بەرگێکی قەشەنگدا

کەوتە بەردیدی ئێوەی ئازیز..





# ئێمە بۆچی لێرەین؟

شێخانی

لە ئەرشیفەوە..
بۆئەوەی هەمیشە لەگەڵ وتەکانی بڕیاردا بژین و پەیامەکانی دوێنێشتان بیرنەچێتەوە، لە ئەرشیفی بڕیارەوە گوڵاوی وشەتان دەکەینەوە بە دیاری..

ئێمە لێرەین..
دەژین بۆ ئەوەی
خەندەیەك بین لەسەر لێوەکانتان...
فرمێسکەکانتان بسڕین
ئازارەکانتان سووك بکەین!
چونکە سبەینێ چاوەڕوانمان دەکات
دوێنێ ڕۆیشتو سبەینێش لەگەڵ
بەرەبەیاندا..
ژووانێکی نوێ چاوەڕوانمان دەکات!
ئێمە لێرەین..
چونکە کەسانێك هەن
پێویستیان بە ئێمەیە یارمەتیان بدەین
بەشداریی بۆنەکانیان بکەین
لەگەڵ خۆشییەکانیاندا پێبکەنین
لەگەڵ ناخۆشییەکانیاندا بگرین
لە پێناویاندا قوربانی بدەین
ئەگەر پێویستی کرد لە پێناویاندا
ڕۆحیشمان دابنێین!
ئێمە لێرەین..
چونکە زۆر کەس هەن
شایەنی ئەوەن ئێمە لە پێناویاندا
شەوانە تا درەنگ بێدار بین
بە ئاوی چاوو خوێنی دڵمان
لەسەر لاپەڕەکانی «بڕیار»
سروودی ژیانێکی نوێتان بۆ بنووسین!
لە وەرزی وەیشوومەو سەرماو
تاریکستاندا
ناوی ئەو ئازیزانە
لە قوڵایی دڵە سپییەکاندا تۆمار بکەین.
ئەگەر وانەکەین
ناتوانین لە دووری دەیان کیلۆمەترەوە
گوڵاوپڕژێنی دڵەکانتان بکەین و
مەستی ئەو بۆنە خۆشەبن و
لەسەر باڵی وشەکانمان
پشوویەك بە ڕۆحتان بدەن.
بۆ ئەوەی ئێمە بۆ هەتا هەتاو
ئێوەش بۆ هەمیشە لە یادو یادگاری
یەکتریدا بژین!
ئێمە لێرەین..
بۆ ئەوەی پێتان بڵێین:
هیواکانمان هەرگیز نامرن
تەنها تەماشایەکی ئاسۆ بکەن
بەهەشتێك لە هیواو ئاواتی بەرز
لە بەردەم نیگای پاکی ئێوەدایە.
چونکە ئێمە دڵنیایین
خۆر هەردەبێت هەڵبێت
شەو هەردەبێت پشتی هەڵکات
بەستەڵەکەکان
هەردەبێت بتوێنەوە
بەهارێکی نوێ
هەردەبێت ببێتە میوانمان!
ئێمە لێرەین..
چونکە دەزانین چەندە
ئێمەتان خۆشدەوێت!
دەزانین کە ئێوە
ئێمە بە شتێکی گەورە دەزانن!!
لەگەڵ ئێمەدا
هیواکانتان چرۆ دەکات
گوڵزاری جوانی خۆزگەکانتان
گوڵاوپڕژێنی گەردوون دەکات!
ئێمە لێرەین..
دەژین بۆ ئەوەی
چۆن وەردەگرین
ئاواش ببەخشین
وەکو باران
وشکەڵانو بیابانەکان
تێراوبکەین
فرمێسکی چاوەکان بسڕین
هاتووین هەرچی لاپەڕەی سپییە
بە جوانترین ڕەنگی ژیان
ڕەنگاوڕەنگ کەین!!
ئێمە دەژین
لە پێناوی ئەو کەسانەی خۆشیان دەوێین
پەڕاوی دڵە سپییەکانیان
پێڵوی چاوە جوانەکانیان
بۆ ئێمە کردۆتە جێ ژووان!
دەمانەوێت جوانترین چیرۆکی
خۆشەویستی بە یەکەوە تۆمار بکەین
جوانترین ساتەکانی ژیان
بەسەربەرین
تەپوتۆزی سەرگوڵزاری زەمەن بسڕین
دڵە شکاوەکان ئاشتکەینەوە!
ڕوومەتە بە ئەسرینەکان جارێکی تر
بە جوانترین خەندەی ژیان
گەشکەینەوە
ژیان هەموو بکەین بە بەهار.
برینەکان سارێژ بکەین
لە بیر بەرینەوە ئازار
باوەشی میهرو بەزەیی
بۆ هەژاران بکەینەوە
بێ نەواکان دڵنەواکەین
ئامێزی نازو ئەوین و خۆشەویستی
بۆ هەتیوە بێنازەکان
واڵابکەین!
لە شەوە زەنگی دەیجوردا
چرایەکی پڕ لە نوور بین!
ئێمە لێرەین..
چونکە دەزانین
ڕۆژانی ژیان دیاریکراوەو
ڕۆژێك دەبێت
ئەم جیهانە جێدەهێڵین
بەڵام دەمانەوێت
ناومان لە قەشەنگترین پەڕەکانی
ڕۆژگاردا تۆمار بکەین..
دەمانەوێت جوانترین یادگاری بین
دوای مردنمان
لە دڵی خۆشەویستانماندا
هەمیشە زیندوو بین!!



ڕۆشنبیری تەندروستی!

# ئامۆژگارییە تەندروستییەکان

## بۆ ژیانی ڕۆژانە

١- زۆر گرنگی بدە بە ژەمی بەیانیان، کەسانێك هەن ژەمی بەیانیانیان فەرامۆشکردووە بە بیانووی ئەوەی نەوەك کێشیان زیاد بکات، یان بە هۆی ئەوەی کاتیان کەمەو بەیانیان پەلەیانە، ئەمە کارێکی تەواو پێچەوانەی تەندروستییە. کارێکی ژیرانە نییە کە ژەمی بەیانی پێکهاتبێت لە خۆراکی قورسی وەکو ژەمی بەیانی هەندێك لە ئەمریکییەکان کە بریتییە لە خواردنی سورەوەکراو لە تاوەدا، هێلکەو ڕۆن.

با ژەمی بەیانیانت بریتی بێت لە بڕێك دانەوێڵەی وەك گەنمو جۆ (شۆفان)، زەیتونو کەرە کە زەیتی زەیتونی بەسەردا کرابێت.

٢- خۆراکێك بخۆ کە ئامادەکرابێت لە لایەن دایکتەوە، یان خێزانتەوە لە ماڵەوە، لەگەڵ خێزانو منداڵەکانتاندا دانیشە، خۆراکێکی تەندروست بخۆ بە ئارامیو بێ هیچ تەنگەژەو مرومۆچییەك.

٣- دوورکەوەرەوە لەقتونراوەکان (معلبات)، خۆراکی ئامادەکراو، خۆراکە خێرا ئامادەکراوەکان، ژەمە خێراکان وەك هەمبەرگرو هاوشێوەکانی.

٤- دوورکەوەرەوە لە شیرینیو چکلێتی قاوەو شوکولاتەو مرەبا، مەگەر بە ڕێژەیەکی کەم.

٥- هەوڵ بدە ئەو خۆراکانە بخۆ کە شەکرە ئاڵۆزەکان ( complex carbohydrates)یان لە خۆگرتووە کە لە دانەوێڵەکانی وەك گەنم بێ لێکردنەوەی توێکڵەکەی، برنج، نۆك، نیسك، پاقلە، هەروەها لە میوەکان، خورماو هەنجیردا هەن.

٦- بە پێی توانا شەکر لە خواردنەکانتدا کەم بکەرەوە، هەنگوین بۆ شیرینکردنی ئەو خۆراکانەت بەکاربهێنە کە پێویستیان بە شەکرە، هەرکات ئارەزووی خواردنی شیرینێت کرد ئەوا خورما بخۆ...

٧- تابکرێت بڕێکی کەم گۆشت بخۆ، وتەکەی عومەری کوڕی خەتاب (خودای لێ ڕازی بێت) چەند جوانە کە دەفەرموێت:- ((دەخیلتان بم لە گۆشت، چونکە گۆشت خوو پێوە گرتنێکی هەیە، کە وەك ئالوودەبوونو خوپێوە گرتنی خواردنەوە کهولییەکان وایە)).

٨- با دوو ژەمت لە هەفتەیەکدا ماسی بێت، وا چاکترە ماسی برژاو بێت نەوەك سورەوەکراو.

٩- بە تەواوی واز لە خۆراکە سورەوەکراوەکان بهێنە، چونکە خۆراکی سورەوەکراو پڕە لە ڕۆنی خراپ بۆ لاشە، پێویستە ئەو زەیتە (ڕۆنە شلە)ی بەکاردێت بۆ سورکردنەوە جارێکی تر بەکارنەهێنرێتەوە.

١٠- سرکە لە زەڵاتەکانتدا بەکاربهێنە، هەروەها لە شۆردنەوەی سەوزەوات دا، چونکە سرکە ماددەیەکی پاکژکەرەوەیەو میکرۆبەکان لەناو دەبات، هەروەك بە توانایە لە پاکژکردنەوەی پووكو دانەکاندا، پێغەمبەری خودا (سەلامی خودای لێبێت) فەرموویەتی ((باشترین پێخۆر سرکەیە))، سرکەی سێو باشترین جۆری سرکەیە.

١١- ئەو بەرهەمانە بەکاربهێنە کە (شیری سویا)یان لەخۆ گرتووە، کە بریتییە لە گوشراوی کرۆکی (ڕووەکی سویا)و هیچ ڕۆنێکی خراپی لە خۆ نەگرتووە.

١٢- باشترین جۆری زەیت: زەیتی زەیتوون، زەیتی گەنمەشامییە.

١٣- لە کاتی کڕینی خۆراکی ئامادەکراودا، پێکهاتەکانی بخوێنەرەوە (المحتویات)، دوورکەوەرەوە لەو خۆراکانەی کە بڕێکی زۆر ماددەی پارێز (المواد الحافظة)یان تێدایە، یان ڕۆنی هایدرۆجینین کراو (واتە گۆڕینی ڕۆنی شل بە ڕەق).

١٤- با خواردنی هەنگوین بڕێکی زۆر نەبێت، چونکە بڕێکی زۆر دەبێتە هۆی قەڵەوی.

١٥- پێویستە لەسەر ئافرەتانو کچانی لاو ئەو خۆراکانە بخۆن کە دەوڵەمەندە بە کالیسیۆمو ئاسنو ترشی فولیك، بە زۆری ئافرەتان لە تەمەنی سکپڕیدا ئەو بڕە کالیسیۆمەی کە دەیخۆن نیوەی ئەو بڕەیە کە لاشەیان پێویستییەتی، بۆیە دواتر هانا دەبەن بۆ کالیسیۆم بە شێوەی دەرمان.

١٦- هەوڵ بدە خۆراکەکانت هەمەجۆربنو خۆشیان لێببینە، ژیانت پڕ بکە لە بەختەوەریو خۆشی، نەوەك ژیانت بکەیتە لانەی خەمو ئێشو ئازار.

ن: د.حسان شمسی پاشا

و: یەحیا محەممەد عەلی

# ڕێگەکانی لابردنی بۆنی ناخۆشی ناودەم..



ئا: هیوا ئارام

بۆئەوەی دووربین لە بۆنی ناخۆشی ناودەم، بۆئەوەی کەس‌وکارو دۆستانو ئەزیزانمان بێزار نەبن لە بۆنی ناخۆشی ناودەممان، پێویستە سەرەتا ئاشنا بین بە بۆنی ناخۆشی ناودەمو جۆرەکانیو هۆکارو چارەسەری.. بێگومان بۆ دوورکەوتنەوە لە هەر نەخۆشییەك دەبێت سەرەتا ڕێگەکانی خۆپاراستنی ئەو نەخۆشییە شارەزابین..

بۆنی ناودەم:

ناودەم لە ڕۆژانی ئاساییدا هیچ بۆنێکی ناخۆشی لێوەنایەت، واتە لەو ڕۆژانەدا کە کەسەکە تەندروستو ئاساییەو هیچ نەخۆشییەکی لەگەڵدا نییە، ئەوا کەسی ئاسایی نابێت بۆنی ناودەمی هەبێت، تەنها ڕاستەوخۆ دوای هەستان لە خەو نەبێت، یاخود لە ئەنجامی هەندێك خواردنی دیاریکراوەوە، جگە لەوە هەر کات بۆنی ناودەمت هات، ئەوە نیشانەی ئەوەیە گرفتێکی تەندروستیت هەیە.

هۆکارەکانی بۆنی ناخۆشی ناودەم:

أ- ئەو هۆکارانەی پەیوەستە بە تەندروستی ناودەمەوە:

١- نەخۆشییەکانی پووك: پوکی ناتەندروست ڕەنگی سور، یان ئاوساوە، نەخۆشییەکانی پووك یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی بۆنی ناخۆشی ناودەم، هەروەها لە ئەنجامی کەڵەکەبوونی کلس لەسەر ددان بۆ ماوەیەکی زۆر، بەبێئەوەی لایببەیت، دەبێتە هۆی هەوکردنی پووکەکان، هەندێجار کارەکە دەبێتە هۆی دروستبوونی گیرفانە لە نێوان پووكو دداندا، دەبێتە جێگەی کۆبوونەوەی خۆراك، سەرەنجام بۆنێکی ناخۆش لە دەمەوە دەردەچێت.

٢- کلۆربوونی ددان: کلۆربوونی ددان دەبێتە حەشارگەیەك بۆ کۆبوونەوەی بەکتریاو پاشاماوەی خۆراك، ئەمەش دەبێتە هۆی بۆنی ناخۆشی ناودەم.

٣- پاکوخاوێنی گشتی ناودەم: پاکنەکردنەوەو نەشۆرینی ددانەکان بەشێوەیەکی باش، یان لانەبردنی پاشماوەی خۆراك لە نێوان ددانەکاندا بە هۆی بەکرەی ددانەوە. دەبێتە هۆی کەڵەکەبوونی بەکتریاو پاشماوەی خۆراك، ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبوونی بۆنی ناخۆشی ناودەم.

٤- پێکهاتە جوڵاوەکان (تاقمی ددان): دانەنانی تاقمی ددانە لە شەوداو پاکنەکردنەوەی لە هەموو شەوێکدا، دەبێتە هۆی بۆنی ناخۆشی ناودەم.

٥- پێکهاتەی جێگیر: پاکنەکردنەوەی چواردەوری ددانە جێگیرەکە، یان خراپی خودی ددانە دروستکراوەکەو هاورێك نەبوونی لەگەڵ ددانەکانی دیکەدا..

٦- دەمی وشك: نەخواردنو خواردنەوە بۆ ماوەیەکی زۆر، دەبێتە هۆی وشکبوونەوەی ناودەم، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەردانی لیك بەشێوەی پێویست نەبێت، ئەوەش سەردەکێشێت بۆ کەڵەکەبوونی بەکتریایەکی زۆر لەسەر زمانو دەبێتە هۆی بۆنی ناخۆشی ناودەم لە بەیانیاندا، هەروەها زۆرجار وشکبوونی دەم لە ئەنجامی ماندووبوونو ڕاهێنانی وەرزشییەوە دەبێت.

ب- ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بەناو دەمەوە نییە:

١- هەوکردنی کۆئەندامی هەناسەدان.

٢- هەوکردنی گیرفانەکانی لووت.

٣- نەخۆشی شەکرە.

٤- گرفتەکانی جگەرو گورچیلە..

چارەسەر: گرنگترین هەنگاو بۆ چارەسەری بۆنی ناخۆشی ناودەم، بریتییە لە سەردانی پزیشکی ددان، بۆ زانینو ئاشکرابوونی بنەماو بنچینەی گرفتەکەو دۆزینەوەی چارەسەر..

چەند ئامۆژگارییەکی گرنگ:

أ- گرنگیدان بە تەندروستی ناودەم: پێویستە ڕۆژانە لانی کەم دووجار دەمو ددانت بە مەعجون بشۆریت، بۆ لابردنی پاشماوەی خۆراكو کلسو پیسی ددان، پاشان بەکارهێنانی پاککەرەوەی ناودەم، چونکە ماددەیەکی باشە بۆ دژە میکرۆبەکانی ناودەم.

ب- بەکارهێنانی بەکرەی ددان: ڕۆژانە جارێك بەکارهێنانی بەکرەی ددان یارمەتیدەرە بۆ لابردنی ئەو پاشماوە خۆراکیانەی دەگەوێتە نێوان ددانەکانەوە، بەتایبەت نێوانی ددانەکانو ئەو شوێنانەی کە فلچەی ددان پێی ناگات.

ج- ئاوخواردنەوەی زۆر: خواردنەوەی ئاو بە ڕێژەیەکی زۆر ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە، لە تەڕکردنی ناودەمو پاراستنی لە وشکبوون، بەردەوامبوون لەسەر ئاوخواردنەوە، ڕێژەی لیك زیاد دەکات، لەناو دەمدا، هەروەها ڕۆڵێکی کاریگەری هەیە بۆ شۆرینو پاککردنەوەی دەم لە پاشماوەی خۆراكو بەکتریا.

د- خواردنی سەوزەی زۆر: زۆر خواردنی سەوزە دەبێتە هۆی نەمانی بۆنی ناخۆشی ناودەم، بەتایبەت کاهوو سپێناخ..

لە کۆتاییدا دەڵێین: پێویستە لانی کەم ساڵانە دووجار سەردانی پزیشکی تایبەت بە دەمو ددان بکەیت، مەرج نییە ئەم سەردانەش تەنها بۆ لای عیادەی تایبەتی دکتوری ددان بێت، بەڵکو بۆئەوەی خەرجییەکی زۆری تێنەچێت، دەکرێت سەردانەکەت بۆ بنکەی تەندروستی ددان، یاخود بۆ کلینکی ڕاوێژکاری ددان بێت، کە خەرجییەکی کەمی تێدەچێت..

ئا: ئەسکەندەر ڕەحیم



# فڕینی شەهێن

جارێکیان پاشایەك دوو شەهێنی بچووکی بە دیاری بۆهات، پادشا وێڕای سوپاسو پێزانینی بۆ خاوەنی دیارییەکە، هەردوو دووباڵندەکـەی بە ڕاهێنـەری باڵندەکانی سـپارد، تا لە بواری ڕاوشکاریدا ڕایان بهێنێتو سودیان لێوەربگرێت. پاش یەك مانگ، ڕاهێنەرەکە هاتەوە بۆ لای پاشـاو گوتی: یەکێك لە شەهێنەکان ڕاهاتووەو ئامادەی ڕاوە.. بەڵام نازانم چی بەسەر ئەوی دیکەیان هاتـووە، هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە، بەسـەر چڵێکـەوە ئۆقرەی گرتووەو دان دەخواتو لە جێی خۆی ناجوڵێتو هەڵنافڕێت.

ئەم بابەتە پاشـای سەرسام کردو فەرمانی دا بە پزیشکانو ڕاوێـژکارانو بەردەسـتانی، کارێك بکەن، تا وا لە شـەهێنەکە بکەن، بفڕێت، بەڵام کەسیان هیچیان لە دەست نەهات.

ڕۆژی دواتـر، بڕیاریـدا بیرۆکـەی ڕاهێنانـی هەڵفڕینـی شـەهێنەکە بە هەموو خەڵکی ڕابگەیەنن.. هەر کەس بتوانێت ئەو شەهێنە فێری فڕین بکات، خەڵاتێکی نایابی لەلایەن پاشاوە پێشکەش دەکرێت. بۆ سبەی بەیانی، پاشا شەهێنی دووەمی دی، لەم چڵ بۆ ئەو چڵ، لەو درەخت بۆ ئەو درەخت دەفڕێت.. پاشا بەم دیمەنە زۆر خۆشـحاڵ بوو، هەربۆیـە فەرمانی داو گوتی: ئەو کەسەم بۆ بهێنن، کە ئەم شەهێنەی فێری فڕین کردووە.

پاسەوانانی دەرباری پاشا، جووتیارێکی بێ دەعیەو دەماریان هێنایە لای پاشـاو گوتیان: ئەمە ئەو کەسـەیە، کە توانیویەتی شەهێنی دووەم فێری فڕین بکات.

پاشـا بە سەرسـوڕمانەوە لێی پرسی: تۆ وات لە شەهێنەکە کـردووە، بفڕێت؟! چۆن ئـەم کارەت کرد؟ ڕەنگە تۆ جادووگەر بیت؟

کاکی جووتیار کە زۆر پەشـۆکابوو، چونکە ئەوە یەکەمجار بوو ڕووبەڕووی پاشا قسـە بکات، گوتی: جەنابی پاشا، کارێکی سـاناو سـادە بوو.. بە تەورداسـەکەم، ئەو چڵـەم بڕییەوە، کە شـەهێنەکە لەسەری هەڵنیشتبوو. شـەهێنەکەش تێگەیشت کە دوو باڵـی هەیەو دەتوانێت بفڕێـتو لە کەوتنە خوارەوە خۆی ڕزگار بکات، ئیدی دەستی بە فڕین کرد.

خوێنەری خۆشەویست.. پێویسـتە، بۆئەوەی بەرەو سەرتر بچین، جاروبـار چڵی ژێر پێمان ببڕین، هەڵبەتە چڵی ژێرپێی خۆمان، نەك هی کەسانی دی.

دەشپرسین:

ئایا چەندە وابەستەی چڵی ژێر پێی خۆتیت؟

ئاخۆ دەزانی: تواناو بەهرەکانت چین؟ دەترسیت؟

ئایا کارمەندەکانی خۆت، باش دەناسـیت؟ ئایا هەوڵدەدەیت گەشە بە بڕشتو بەهرەیان بدەیت؟

یان لە ترسی بازدانو فڕین، بە چەند چڵێکی ڕێکخراوەکەتەوە وابەستە دەکەیت؟

ئایا باشـتر نییە، کارمەندانی بەتواناو چالاك لە ڕێکخراوو دەزگاکەتدا هەبن؟

ئایا خاڵە بەهێـزو بەبڕشـتەکانی دەزگا، یاخود ڕێکخراوو کۆمپانیاکەی خۆت دەزانی؟

ئایـا بەپیـری هەڕەشـەکانەوە دەچیـت.. یـان هەمیشـە خۆدەپارێزیتو بیر لە هێشتنەوەی بارودۆخی ئێستە دەکەیت؟

ئایا لە ڕووبەڕووبوونەوەی هەڕەشـەو گرفتەکاندا، بەهرەو بڕشتو هێزو وزەکانت دەردەخەیت؟

لێـرەدا بیـری گوتەیەکـم دەکەوێتـەوە، کـە باوکم بۆی گێڕامەوە.. کە باسی دەستو پێ سپیبوونو داماوی دەکات. باوکم گوتی:

ئاشـنایەکم هەبوو دەیگوت: ئەگەر منداڵەکەم لەبەرچاومدا بکەوێت.. هەڵی ناسێنمەوە.

گوتم: لەبەرچی؟

گوتی: دەمەوێت لەسەر پێی خۆی بووەستێتو پشت بەخۆی ببەستێت.. بۆئەوەی وەك ئەو کەسانە نەبێت، کە تووشی گرفتێك هاتن، دەسـتەوئەژنۆ دادەمێننو دنیایان بەو بەرفراوانییەوە لێ تەنگ دەبێتەوەو نازانن چی بکەن. من ئەگەر هەر لە ئێستەوە ڕای بهێنم لەسـەرئەوەی بەردەوام یارمەتی بدەم، ئەوا هەردەم لە کاتی کەوتندا هەڵناسێتەوەو وا دەزانێت هەتا کەسێك دەستی نەگرێت، ناتوانێت هەڵبسێتەوە.

سەرنج بدە: ئەگەر دایکە جوولەکە، زەرناقووتەکەی خۆی لە هێلانەکـەوە، هەڵنەداتە خـوارەوە، هەرگیز باڵ ناگرێتو فێری باڵەفڕێ نابێت.



# با سوود لە پشووی هاوین وەربگرین

تاقیکردنەوەکان کۆتاییان هاتو وادەی خەڵەو خەرمانو کۆکردنەوەی بەرهەمی ساڵێك ماندووبوونو تێکۆشانو هەوڵی بێ وچانە، ئەوەی هەوڵیداو خۆی ماندووکرد، ئەمڕۆ دڵخۆشە بە ئەنجامەکان، ئەوەی کەمتەرخەمی کردو وەکو پێویست هەوڵی نەداوە، ئەمڕۆ پەشیمانەو پەنجەی پەشیمانی دەگەزێت.

هاوکات پشووی هاوین دەرگای واڵایەو دوای ڕۆژێکی سەختو شەوانێکی دژواری تاقیکردنەوەکان، کاتی ئەوە هاتووە کە پشوویەك بدەین بە گیانی شەکەتو ماندووبوونمان، پشوویەك ئاوێتەبێت لە بەرنامەی بەسودی پشوو ئامێزو سوود وەرگرتن لە کاتو ساتەکانی تەمەن کە سەرمایەی مرۆڤن.

**با لەم پشووی هاوینەدا:**

١- کاتێك دیاری بکەین بۆ خوێندنەوەو لە بەسوودترینو خۆشترین کتێبە ئەدەبیو ڕۆشنبیرییەکان سوودوەربگرین.

٢- با بەهرەکانمان پەرەپێبدەینو زیاتر بەرەو پێشەوە بچین، بەهرەکانی خۆشنووسیو نەخشو نیگارو وەرزشو هتد، بە پەرەپێدان گەورەتر دەبن.

٣- با سوود لە خولە زانستیو ڕۆشنبیرییەکان وەربگرین، وەکو خولەکانی (زمان، کۆمپیوتەر، پەرەپێدانی مرۆیی).

٤- سەیرانو گەشتو گوزار، ماندوێتیمان لە بیردەبەنەوەو وزەو توانایەکی نوێمان پێدەبەخشن.

٥- با لەم پشووەدا سەردانی خزمو دۆستو کەسوکارمان بکەینو دڵخۆشیان بکەین.

٦- با پەیوەندی کۆمەڵایەتیمان پتەوبکەینو لە نێو دراوسێو هاوڕێکانماندا نموونەی کەسایەتی کۆمەڵایەتی سەرکەوتووبین.

٧- ئەگەر لەو قوتابیانەین کە ساڵی داهاتوو دەچینە پۆلی (١٢) با بەشداری خولی ڕێنمایی بکەین، بۆئەوەی بتوانین ساڵی داهاتوو بە ویستی خودا باشترین نمرە بەدەستبهێنین، هەروەها ئەگەر دەرچووی پۆلی (١٢)ین، ئەوا بۆ هەڵبژاردنی کۆلێژو زانکۆکان سوود لە ڕێنماییەکانی کەسانی پسپۆر وەربگرین.

٨- بۆئەوەی کەمێك پاداشتی ماندووبوونو هاوکاری بێسنووری ماڵەوەمان بدەینەوە، با هەوڵدەین لەم ماوەیەدا هەر پێویستییەکی ماڵ، یاخود هەر کارێکی ماڵەوەمان هەیە، ئەنجامی بدەینو هاوکاری باوکانو دایکانمان بکەین.

٩- با بەکارهێنانمان بۆ خزمەتگوزارییەکانی ئینتەرنێت، ئامانجدارو بەسوود بێتو تەنها بۆ سەرگەمیو کات بەسەربردن نەبێتو سوودو کەڵکی لێوەربگرین.

١٠- با کاتێك دیاری بکەین بۆ کاری خۆبەخشو یارمەتیدانی هەژارانو لێقەوماوانو دڵخۆشکردنی نەخۆشانو دەردەداران با بە دیارییەکی بچکۆلە، یان بە وتەیەکی خۆشیش بێت.

١١- با لایەنی ئیمانیمان پتەوتر بکەینو سوپاسی پەروەردگار بکەین، بەرامبەر بەو هەموو نیعمەتەی کە لە ژمارە نایەت، با پەیوەندی بکەین بە قوتابخانەکانی فێربوونو لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزو لە کەشو هەوایەکی پیرۆزدا پشوو بە ڕۆحمان بدەینو بە بیستنی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان، دڵەکانمان ئاو بدەین.

به هیوای پشوویەکی خۆشو شادمان بۆ هەموو لایەك

# بەکارهێنانی ژیری، وەك گرەنتییەك بۆ باشتر ژیان




زاهیر زانا

ژیری ئەندازیارو ڕێکخەری تەواوی کاروبارەکانمانە، ئەو بەهرە مەزنەیە کە بە هۆیەوە مرۆڤ کامڵترینو بەڕێزترینو بەرزترینو بەهێزترین بونەوەری سەرزەوییە، چونکە مرۆڤ لە رووی تواناو گەشەو هێزی جەستەیی‌و زۆربوونو تەمەنەوە لە زۆرێك لە گیانەوەرانی تر لاوازترو بێ هێزترە، بەڵام بە هۆی هێزی ژیرییەوە بۆتە سەردارو زیندەوەرانی تری خراوەتە ژێردەست، وەك لەم چیرۆکەی خوارەوە بەهای ژیریمان بۆ ڕۆشنتر دەبێتەوە.

(دەڵێن جارێك شێرێك پیاوێك دەبینێتو پەلاماری دەداتو دەیدات بەزەویداو دەیخاتە ژێر چنگی بازووە بەهێزەکانییەوەو دەیەوێت بیخوات، لەو کاتەدا ئامۆژگارییەکی دایکی دەکەوێتەوە بیر کە پێی دەڵێت: کوڕی خۆم تۆ پادشای دارستانی‌و بەهێزو بە توانای، سڵو ترست لە هیچ گیانەوەرێك نەبێت، تەنها خۆت لەو گیانەوەرە بپارێزە کە لەسەر دوو پێ دەڕواتو پێی دەڵێن مرۆڤ، چونکە خاوەنی ئەقڵە.. بۆیە بە نەڕەیەکەوە بە پیاوەکەی گوت ئێوە خاوەنی ژیرین، ئایا دەتوانیت پیشانم بدەیت بزانم ئەوە چییە ئێوە هەتانەو ئێمە نیمانە؟ ئەویش بیری لەم فرسەتە کردەوەو وتی: ئێستا لەماڵەوە دامناوەو لەگەڵ خۆمدا نەمهێناوە، شێرەکە وتی برۆ بیهێنەو پیشانم بدە، ئەویش وتی: ئاخر هەتا من دێمەوە تۆ دەڕۆیت، با بتبەستمەوە تاوەکو ڕانەکەیت، بە گوریسێك هەرچوار پەلی شێرەکەی توند بەستەوەو پاشان بەکوتەکێك زۆرباش شێرەکەی کوتاو پێی گوت: ئەوە ئەقڵە کە منی لە ژێر دەستی تۆ دەرهێناو تۆی خستە ژێر دەستی من...)

ئێمەی مرۆڤ خاوەنی ئەم سەرمایە بەنرخەین، بۆیە پێویستە بەباشترین شێوە لێی بەهرەوەربببینو ژیانێکی شایستە بەئاقڵبوونمان دەستەبەربکەینو ژیریمان بکەینە کۆڵەکەی ئارامی‌و هاوسەنگی‌و بەهۆیەوە دەستبگرین بەسەر تەواوی هەستەکانمانو لە ڕێگەیەوە بەشێوەیەکی ڕێكو پێكو تەندروستو دروست، پێداویستییە جەستەیی‌و دەروونی‌و ڕۆحییەکانمان دەستەبەربکەینو دووربکەوینەوە لە دڵەڕاوکێ‌و پشێوی‌و تواناو وزەکانمان زیادبکەینو ئامانجمان هەبێت لە ژیانداو لە پێناویدا هەوڵو کۆشش بکەینو داهێنانکارو سودبەخشبینو کەسایەتی سەربەخۆی خۆمان دروستبکەینو بونیادی فیکری‌و مەعریفی‌و پیشەیی خۆمان دابمەزرێنینو بەرەو پێشی بەرینو گەشە بدەین بەلایەنە چاكو بەسودەکانو هەوڵی بنەبڕکردنو چاککردنی هەموو جۆرە ناتەواوی‌و کەمو کوڕییەك بدەین.

توانای مێشکی مرۆڤ زۆر فروانو بێ سنورەو بەجۆرێك بۆ مەزەندەی تێگەیشتن دانراوە کە تەنها توانای خەزنی مێشکی مرۆڤ چوارسەد کیلۆمەتر موجەلەد کتێبە، تا ئێستا بەخستنەگەڕی بەشێك لەو توانایانە پێشکەوتنی گەورە بەدەستهاتوون، بۆ نموونە وڵاتێکی وەك یابان دوای ئەو تێکشکانو وێرانبوونە گەورەیەی لە جەنگی دووەمی جیهانی ڕووبەڕووی بووەوە، توانیان بە هۆی کارکردنو بەکارهێنانی هێزی ژیرییەوە لە ماوەیەکی کورتدا پێشکەوتنی بەرچاوی تەکنەلۆجی بەدەستبهێننو ببنە دووەم وڵاتی ئابووری لە جیهاندا!!

مێشکی هەر یەکە لە ئێمە لە باریدا هەیە داهێنانو شاکاری گەورە بکات لە تەواوی بوارەکاندا، بەمەرجێك خۆمان دەرفەتی خستنەگەڕی بۆ بکەینەوەو دەرگای بەڕوودا ئاوەڵابکەین تا ڕووناکی‌و تیشکی خۆی بەخش بکاتو بیرکردنەوە بکەینە بەشێکی دانەبڕاوی ژیانمان، ئەقڵی ئێمە وەك داینەمۆو ویستگەیەکی گەورەی کارەبا وایە، بەڵام خۆمان زۆرجار تەنها گلۆپێکی چەند واتی لێ دەبەستینو هەموو وزەکانمان ناخەینە گەڕ، لەبەرئەوە باهەمیشە ئەم وتەیەمان لە بیربێت کە دەڵێت: (بەکارنەهێنانی بەهرەیەك کە خودا پێی بەخشیوین، وەك کوفرانەی نیعمەت وایە)، زۆرجار ئێمەی مرۆڤ زیادەڕەوی دەکەین لە بەکارهێنانی وزەی جەستەییمان، بەڵام بێ ئاگاین لەو سەرمایە مەزنەی پێی دەوترێت عەقڵو تا ڕادەیەکی زۆریش فەرامۆشمان کردووە، لە کاتێکدا وزەی عەقڵ زۆر پێویستترو گرنگترو گەورەترە لە وزەی جەستەو بگرە زۆریش بۆ زیندەگی‌و پێشخستنی وڵاتو بیروباوەڕو خود سودمەندترو ئومێد بەخشترە، جگە لەوەی زیادەڕەویی دەکەین لە تێرکردنو خۆراك پێدانی گەدەمان، بەڵام بەداخەوە خۆراك پێدانی عەقڵو هزرمان لەیاد کردووە، وەك ئەوەی هەر نەبێت! سەرمایەگوزاری لە لایەنە مادی‌و بەرجەستەکانی ژیان دەکەین، دیسان گەورەیی‌و دەوڵەمەندی عەقڵمان بیر چۆتەوە، وەك ئەوەی هەر نەبێ، چونکە کەمتر لە بیری داین، هەربۆیە داهێنانمان کەمترو گرفتو دەردەسەریمان پترترە.

هاوڕێی بەڕێزم، ئەمجارە هێزو گەورەیی ژیریت تاقیبکەرەوە، ئەوجا دەزانی وەك خۆر وزە بەخشو ڕووناکە، چۆن ڕووەكو سەوزایی بەتیشکی خۆر گەشە دەکەن، بەوشێوەیەو زیاتریش بوونو داهێنانو ژیان بەبەکارهێنانی ژیری گەشە دەکەنو دونیایەکی ڕەنگینو سیحراویمان بۆ بەرهەمدەهێنێت، با پەلەبکەینو ژیریمان بکەینە ئامرازی باشترکردنو بنیادنانی ژیانمان.

خالید محەممەد

# پێی بڵێ خۆشمدەوێیت



لەم ڕۆژانەدا بیرم لە حاڵەتێك كردەوە كە هانیدام ئەم بابەتە بنوسم، كاتێك كە گەنج خۆشەویستی دەكات، تەواوی وشە بریقەدارو ناسكەكان ڕیزدەكاتو كام شت زۆر جوانە ئامادەیە بە خۆشەویستەكەی بچوێنێت، نەك هەرئەمە بەڵكو بۆئەوەی جوانترین تێكست بنێرن بۆ خۆشەویستەكەیان ڕەنگە ببنە شاعیر، تەنانەت كتێب هەیە كە دەتوانن كورتەنامەی شیعری لێوەربگرن، لەگەڵ هەموو تێبینیەك لەسەر خۆشەویستی لە پێش هاوسەرگیریو ئایا ڕێگەی پێدراوە، یان نا، ئەمە بابەتێكی ترەو باسی ئێستەمان نییە، ئەوەی بووە جێی سەرسوڕمانی من لە بابەتەكەدا بۆچی دوای ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری كە ئیتر ئێستە ڕەوایە بۆ تۆ كە هەرچۆنێك بتەوێت بە شانوباڵی خۆشەویستەكەتدا هەڵبدەیتو بیكەیتە مانگو پەپولەو حۆریەی دەریاو گوڵو گوڵەباخو چنورو شەوبۆ، بەڵام دەوەستێت!! بۆچی ئیتر لە هەناسەكەەو گوڵەكەەو ڕوحەكەەو ئازیزمەوە دەبێتەوە بە ناوی خۆی، یان ماڵەوەمان، یان دایكی منداڵان، یان خێزانم!!

لە هەمووی سەیرتر من خۆم چەندجار تێبینی ئەوەم كردووە بەتایبەت لەناو پاسدا دەتوانیت بە شێوازی قسەكانی برادەرەكەی تەنیشتت، بزانیت كە هاوسەرەكەیەتی، یان برادەرەكەیەتی پەیوەندی پێوە كردووە، لەگەڵ هاوسەرەكەی تەنها بە ئاو باشو چیمان هەیە قسە دەكات، بەڵام لەگەڵ برادەرەكەی (سەلام چۆنی كوڕی باش ئەحواڵت، چییە لە فەقیر ناپرسی، بڕوابكە زۆرر بیرم دەكردی، ئێ دەنگوباس چۆنە......).

پرسیارەكەی من لێرەدا ئەوەیە، بۆچی لە پێش هاوسەرگیری هەموو وشەیەك ئاساییە، بەڵام كە بوونە حەڵاڵو هاوسەری یەكتر، ئەو قسانە دەچنە كێچی كەوڵەوەو وجودیان نامێنێت؟ بۆچی ئەو كاتە شەرم نەدەكرا، كەچی ئێستە كە هاوسەری یەكترن، ئەگەر پێیبڵێ خۆشم دەوێیت، شینو مۆرو سور دەبێتەوەو شەرمەزار دەبێت؟!!

ئەگەر چەند نمونەیەك بخەمە پێشچاوی تۆی بەڕێز كاتێك كە بە هاوسەرەكەتت وتوە لە كاتەكانی تەمەنی پێكەوەبوونتان، بزانە كامیانت بەكارهێناوە، بۆچی ئێستە ناتوانیت بەكاری بهێنیت، بۆ نموونە ڕۆژێك بە هاوسەرەكەتت نەوتوە:

١- هەموو موڵكو ماڵەكەم.
٢- تۆ مایەی بەختەوەریو خۆشحاڵی منی.
٣- تۆ جوانترین دیاری بۆ من.
٤- لەگەڵ تۆ جارێكی تر ژیانم دەستپێكردەوە.
٥- زۆر دڵخۆشم كە لەگەڵ تۆ لە ژێر ساباتێكدا دادەنیشم.
٦-من زۆر بەختم هەیە كە لەگەڵ تۆم.
٧- ئەو كاتەی بوومە هاوسەری تۆ، جارێكی تر لە دایكبوومەوە.
٨- تۆ نیعمەتی خودای بۆ من.
٩- سوپاسی خودا دەكەم كە تۆی بە من ناساند.
١٠- خۆشەویستەكەم.

دەزانم ڕەنگە ئێستە بڵێیت: خۆ ئێمە هەتا قیامەت ناكرێت عاشقایەتی بكەین، بەڵام منیش دەڵێم بۆ ناكرێت؟ بۆ هەوڵنەدەین وابكەین؟ مەگەر دەرەنجامەكانی ئەو عاشقایەتیە لە ژیانی خێزانیدا خۆشی بە كێ دەبەخشێت؟ تۆ نیت كە ژیانت خۆشدەبێت؟ تۆ نیت كە دەروونت ئارام دەبێت؟ تۆ نیت دەبیتە نموونە بۆ منداڵەكانت؟ تۆ نیت دەبیتە دامەزرێنەری مەملەكەتێك لە ڕێزو وەفاو خۆشەویستی؟

ئەگەریش شەرم دەكەیت وشەو پەیڤی ناسك بۆ خێزانەكەت ڕیزبكەیتو ڕاستەوخۆ سەیری دەموچاوی بكەیتو پێی بڵێیت، دەكرێت بە نامەیەك لە پشتی كارتێكی جوان بۆی بنوسیتو بیخەیتە جانتاكەیەوە، گەرنا لە شوێنی كارەكەتەوە بە كورتەنامەیەك بەسەری بكەرەوە، دڵنیابە موعجیزە لە ژیانتاندا ڕوو دەدات.

ڕاستە تۆ خێزانی خۆتت خۆشدەوێتو هەموو ژیانت بۆ تەرخانكردووە، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانیت كە هەموو كات كردار بە گوفتارەوە تەواوەو گوفتاریش بە كردارەوە وەردەگیرێت، هیچی تێناچێت (دەمە چیت لێ كەمە) تەنها نوسینی چەند پەیڤێكی جوانو ناردنی بە كورتەنامەیەك چەندین كێشە لە نێواندا دەتوێنێتەوە، تاقیبكەرەوەو دەرەنجامەكەی دەبینی.

پێی بڵێ خۆشم دەوێیت، ئاساییە پێویستناكات شەرم بكەیت، پێیبڵێ تۆ شاجوانی دڵی منی، ئاساییە، پێیبڵێ ژیان بەبێ تۆ تاریكە شەوە، ناخۆشە، تاڵە، پڕئازارە.

بەڵێن ئەنوەر



# هەموومان بەرپرسیارین!!

ئەو بەڵگانەی کە گوزارشت لە ڕاستییەکان دەکەن دەرهاوێشتەی بیرو هزرێکی پاکو زولاڵن، واتە ئایدۆلۆژیا هەڵێنجان بۆ ئەو ڕووداوانە دەکات کە ڕۆژانە ڕووبەڕووی ئەو کەناڵە شیکارییە باڵایەی مرۆڤ دەبێتەوە، کەواتە خودی مرۆڤ ناوەندێکە بۆ شیکردنەوەی واقیعی کۆمەڵگا. یەکێك لە گرفتەکانی ئەمڕۆی کۆمەڵگا خۆی لە دوو تەوژمی خێرادا دەبینێتەوە: «تەوژمێکیان بریتییە لە نەبوونی هزرێکی گەشەسەندو تاکو تەعبیر لە واقیعی کۆمەلگاکەی بکات، ئەوی دیکەشیان بریتییە لە هزرێکی ڕێژەیی کە ئەویش دابەش دەبێت بەسەر دوو چیندا: لە چینێکیاندا هزرێکی پاك ڕەنگدەداتەوەو لە چینەکەی دیکەشیاندا تەنها هزرێکەو بەس» کە ئەم چینەیان زۆربەی جار پێگەی کۆمەلگا لاواز دەکاتو دەبێتە کۆسپێك لە نێوان دەزگای شیکاری ئایدۆلۆژیا بۆ واقیع. واتە ناهێڵێت پردێك دروست بێت لە نێوان گشت ئایدۆلۆژیا جیاوازەکانی کۆمەڵگا، کە خۆم بڕوایەکی تەواوم بە فەلسەفەی گونجێنگەرایی هەیە، بەڵام زۆربەی جار بە هۆی بوونی کاریگەری نەرێنی ئەو هۆکارانەی کە ئاماژەم پێکرد هەڵگەرانەوەیەك بۆ تەفسیرکردنی ڕاستییەکان لە خودی ئەو جۆرە فەلسەفەیەدا دروستدەبێت!

لێکتێگەیشتن فاکتەرو دەروازەیەکە بۆ کرانەوەو بەردەوامبوونمان لە کارەکانماندا، بەرهەمی کاری سەرکەوتووش بوونی هەستکردن بە بەرپرسیارێتییە بەرامبەر ئەو کارە، واتە هەموو ئەرکەکان بە زنجیرە تەواوکەری یەکترین، ئەوە خودی مرۆڤە کە هەندێجار شێلگیرانە هەوڵی پچڕاندنی ئەو زنجیرە شاهانەیە دەدات. ڕاستە مرۆڤ ئازادە لەم ژیانەدا، بەڵام خۆ بە ئەندازەی ئەو ئازادییەش بەرپرسیارێتی لەسەر شانەو دەبێت تەواویان بکات، واتە نابێت بەرژەوەندی تایبەتی خۆی لە ژێر ناوی ئازادی، لەسەر حسابی مافو بەرژەوەندی کەسانی تر تەواو بکات، چونکە ئەمە تەنگەژەیەو داڕوخانی کۆمەڵگای لێدەکەوێتەوەو هەژمونێکی سەرتاسەری گەورە دەخوڵقێنێت. لەم چەرخەدا زانست پێویست نییە، بەڵکو پەروەردەی زانستی پێویستە، بانگەواز پێویست نییە، هونەری بانگەواز پێویستە، ڕووناکی پێویست نییە بەڵکو بینینی ڕووناکی پێویستە، بەڕاستی ئێمەی مرۆڤ زۆرجار بەدەستی خۆمان، خۆمان توشی ماندووبونی بێسود دەکەین، کاتێك سنوری خۆمان دەبەزێنینو هەستیشی پێناکەین، چونکە بەڕاستی ناوەڕۆکی ستراتیژیەتی کارو بەرپرسیارێتی لەوەدایە کە مرۆڤ

ئـــەوەی هەیەتی لەگەڵ کەســـانی تردا بەشـــی بـــکات، واتە کاتێك مرۆڤ گوزارشـــت لە مەبەســـتو بۆچونێکی خۆی، یـــان مەبدەئو دینی خۆی دەکات، دەبێت شـــێوازی گوزارشـــتەکەی زۆر مەنتیقیو دەقیق بێت، لەگەڵ چەمكو دروشمو ناوەڕۆکی دینەکەیدا، چونکە کرۆکـــی هەر دینێك بۆ ئیســـلاحی لایەنگرانی ئـــەو دینە هاتووە، نەك شـــەلەلکردنی کۆمەڵگاو قوفڵکردنی عەقڵـــی پەیڕەوانی ئەو دینـــە، کەواتە بەهیچ شـــێوەیەك لـــە هەر دینێکداو بـــە تایبەتی لە ئیســـلامدا نەهاتووە کە دین لە دەســـتی چینێکـــی دیاریکراوو فیئەیەکی تایبەتدا بێـــت، ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ بێ جیاوازی. دکتۆر عەلی شەریعەتی لە کتێبی شۆڕشی خودسازیدا نمونەی خواپەرستێکمان بۆ دەهێنێتەوە کە لە نێوان چواردیواردا خەریکی پەرستشـــەو لەو دیو ئەو چوار دیوارەشەوە چی خراپەیە ڕوودەداتو کەچـــی ئەم بەخەیاڵیدا نایەت!! کەواتە زۆرجار بەرەو نەزانـــی چون لە دینداریدا، وا لە مرۆڤ دەکات هەســـت بکات ئەو کارانەی کە دەیکات هەمـــووی لە بەرژەوەندی خواو دینەکەیدایە. کەواتـــە ئەگەر دینداری بەوشـــێوەیە بێت لای دینـــدار «ئەو کاتە دینداری دەبێت لای نەزانو بێ دین چۆن بێت؟

ئەمـــڕۆ زۆرێکمان بـــە تایبەتی گەنجـــان وادەزانین کە ئەرکو بەرپرســـیارێتی خۆمان بە تەواوی جێبەجێکردووەو دانیشـــتوینو چاوەڕێی پاداشـــتەکەی دەکەین! بەڵام ئەوەندەی کاری گشتیمان لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆمان بەکارهێناوە، ئەوەندە ڕەچاوی ســـودی گشـــتیمان نەکردووە. یاســـایەکی (وەزعی) کە دەستکردی مرۆڤە، ڕێگا نادات بە دادوەر کە دەقێکی یاســـایی لە بەرژەوەندی خۆیدا تەفســـیر بکات، ئیتر چۆن دەبێت خودای گەورە ڕازی بێت کە دەقێکی شەرعی لەبەرژەوەندی خۆمان تەفسیر بکەین!!

﴿ أَفَتُؤۡمِنُونَ بِبَعۡضِ ٱلۡكِتَٰبِ وَتَكۡفُرُونَ بِبَعۡضٖ ﴾، کەواتـــە ئێمە وەکو چینی گەنجان پێویســـتە ڕۆشنبینو ڕۆشنبیر بین، لەو مەســـەلە هەستیارانەدا بادەستهەڵگرین لە هەندێك ئایدۆلۆژیەتو فکرەی سەیرســـەیری بـــێ بنەما» دەمارگیری ســـەری ئوممەتانی پێـــش ئێمەی خوارد»دەی ئایا ئـــەوە نەفامی نییە کە ئێمە داوای وەها ئەزمونێك بکەینو بە ئیسلاحی خۆمانی بزانین!؟

ئەمڕۆ زۆر پێویســـتمان بە یەکتر قبوڵکردن هەیەو پێویســـتە گرنگی بە ڕاوبۆچونی یەکتری بدەینو یەکتری بخوێنینەوەو گوێ لـــە یەکتری بگرینو پلانی بەرامبەر بەهەنـــد وەربگرین، چونکە بەڕاســـتی هەمیشـــە جڵەوی پردێك لە دولایەنەوە دەگیرێت دەی کەواتـــە ئەگەر ئێمە ناتوانین بالأنســـی ئەو پـــردە ڕاگرین، بۆچی هەوڵی تێکدانو پچڕاندنی بدەین!؟

جارێکیـــان عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان چووە ســـەر دوانگەو وتـــی: ئـــەی میللـــەت ئێوە چیتـــان دەوێـــتو داوای چی لـــە ئێمە دەکـــەن» ئەگەر دەڵێن کە ئێمە گەنـــدەڵو خراپەکارین، ئەوا خۆ ئێوەش بەشێکن لەو گەندەڵیو خراپەکارییە «چونکە نەتانتوانیوە تۆوی خۆشەویســـتیو برایەتی لە نێوان خۆتاندا بچێـنن»، ڕاســـتی فەرمـــووە ئێمە پێویســـتە کاتێك کە داوای شـــتێك دەکەین خۆمان ئامادەباشییەکمان تێدا بێت، بۆ ئەو شتەو شایەنی ئەو شتە بین کە ئەمەش ســـەرەتای هەماهەنگییەو ڕێگاخۆشکەرە بۆ هەوڵی زیاترو بەدەستهێنانی مافی زیاتر. بۆ نموونە ئێستا کە من ئەم شتانە باس دەکەم مەرج نییە کە هەموو ئەم شـــتانە لە خۆمدا پەی پێـببەم، مەرجیـــش نییە هەمـــوو ئەو شـــتانەی کە دەیزانـــم بیڵێم، بەڵام مەرجە ئەوەی کە گوتومە بیزانم. بەرپرســـیارێتی لەم سەردەمەدا زۆر قورسە، چونکە لایەنێك بە تەنها ناتوانێت ئەو بەرپرسیارێتییە هەڵبگرێت، بەڵام ئەوەی پێویســـتە ئەوەیـــە کە هەر یەکێکمان لە ئاســـتی خۆمانەوە بێینە پێشـــەوەو بەبوێری هەڵوێســـتی خۆمان ڕابگەیەنین، چونکە بەڕاســـتی کارەســـاتە ئەگـــەر بێتو کۆمەڵێك، یان دەســـتەیەکی دیاریکراو لە جیاتی هەموو کۆمەڵگا بڕیار بداتو تەرحی بۆچونی خۆی بکاتو بیســـەپێنێت بەسەرماندا، بەبێئەوەی لێکدانەوەیەکی پێشوەختەی لەســـەر بنەمای پسپۆریەتی تەواو بۆ کرابێت، ئێمە قبوڵی بکەین! بەڕاستی کارەساتێکی گەورەیە کە زاناو هونەرمەندێـــك بکەوێتە ژێر چنگی بـــێ هونەرێکەوە. پەروەردگار دەفەرموێ ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ ﴾.

لێرەدا ئەگەر کەســـێك، یـــان لایەنێك نییەتی خراپی خۆی بە کۆمەڵگاکەی تاقیبکاتەوەو مەبەســـتی ســـتەمو زۆرداری بێت، ئەوا پێویســـتە هەریەکێمـــان بەپێی توانای خۆی هەڵوێســـتی هەبێتو هەســـت بە بەرپرســـیارێتی بکات لەسەر بنەمای (الوقایە خیر من العـــلاج)، ئەگـــەر وا نەکەین ئەوکاتە فیتنەکە تووشـــی هەموومان دەبێتو لەدوایدا ڕەشو سپی جیاناکرێتەوە.

جارێکیان ئیبلیس تەواوی دەستەو تاقمەکانی خۆی بڵاوکردەوەو هـــەر تاقمێکی ڕەوانەی شـــوێنێك کرد، بەمەبەســـتی بەرپاکردنی ئاشوب و فیتنە، دەستەیەکیان چون بۆ شوێنێكو بینییان پیاوێکی خواپەرستی پاکی لێیە، بیریان دەکردەوە کە چۆن لەخشتەی بەرن، کاتێك هەوڵەکانیان تاقیکردەوەو سەری نەگرت، لە دوایدا گەڕانەوە بۆلای ئیبلیسو بابەتەکەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش پرسیاری ئەوەی لێکـــردن کە ئایا ئەو پیـــاوە فەرمان دەکات بە چاکەو نەهی دەکات لە خراپە؟ ئەوانیش گوتیان لەو ماوەیەی کە لەوێ بووین شـــتێکی لەو جۆرەمان لێنەبیســـت! ئیبلیســـیش گوتی: ئێوە خۆتان ماندوو کردووە کە ئەو ماوەیە لەوێ ماونەتەوە، وازی لێبێنن، ئەوە پیاوی خۆمانە!! بزانن بەڕێزان کە بەپرســـیارێتی زۆر لەوە گەورەترە کە ئێمـــە لێی حاڵی بووین. ئەوەتـــا پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەســـەر بێت) دەفەرموێت: {بلغوا عني ولو آية}»، دیارە حیکمەت لەم فەرمودەیەدا زۆرە بەڵام ئێمە درکی پێناکەین. بە تێگەیشـــتنی من یەکێك لە فەلسەفەکانی ئەم فەرمودەیە ئەوەیە کە زنجیرەیەك لە تێگەیشتن دروستدەکات، لەوانەیە ئەو قسەیەی کە تۆ دەیکەیت هیچ کاریگەرییەکی نەبێت لەســـەر کەســـانی بەرامبەرت، بەڵام کێ نالێ کە ئەگەر یەکێك لەو کەســـانە ئەم قسەیەی تۆی بۆ کەسێکی نزیکـــی خـــۆی گێڕایەوە، ئەم قســـەیە شـــوێنێکی بـــاش ناگرێت؟! هەروەکو (ســـەحبانی وائیلیان) کە وتاربێـــژێکی زۆر لێزانو شارەزا بوو، ڕۆژێکیان لە گەرمەی وتاربێژیدا بوو، تنۆك تنۆك فرمێســـك بەچاوەکانیـــدا دەهاتـــە خـــوارەوە، بەڵام هیچ کام لـــە ئامادەبووان پێی کاریگـــەر نەبوون!! کەچی لە دەرەوەی حەرەمی مزگەوتەکەدا ڕێبوارێـك خەریکبوو تێدەپەڕی، لە ناکاو هاوارێکی لێوەبەرزبۆوە، بەقســـەکانی ســـەحبان یەکســـەر لەهۆش خۆچوو، هەربۆیەش کە گوتویانە نزیکانی دوور بێ ئاگاو دوورانی نزیك ئاگادار.

هیـــوادارم ئەم وتـــارە ببێتە کلیلێـــك بۆ کردنـــەوەی دەرگای ڕاســـتییەکانو بنیادنانی کۆمەڵگایەکی بەرپرســـیارو بەڕەوشـــتو دلســـۆز، هەروەکو خۆشەویســـتمان فەرمویەتـــی: (کلکم راع وکلکم مسئول عن رعيته) بەڕاستی بەختەوەری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە هەست بە بەرپرسیارێتی خۆی دەکات.

# ئەو مرۆڤانەی هەرکات بێن، هیچ کات.....



درەخشان بەهادین

جوگرافیـای هەڵسـوکەوتو ئاکاری مرۆڤـەکان، یەکێك لە ئاڵۆزترینو سـەیرترین نەخشـەکانی ناوەوەو دەرەوەی سنوری تێدایە. بـە دڵنیاییەوە بۆ جارێکیش بێت لـە نێو کتێبەکانی دەرونزانـیو کۆمەڵناسـیدا چاوتان بـە پۆلێنکردنی تاکەکانو دابەشـبوونیان لە رووی باری دەروونیو جۆری رەفتارکردنیان کەوتـووە. یاخـود دەروونناسـی رەنگەکانتـان خوێنـدوەو تاقیکردۆتەوە.

دەمانەوێـت نموونەیەکی پۆلێنکردنـی نوێ، خاڵی لە هەر سـتانداردێکی زانستی پێشـکەش بکەین، تا بە هۆیەوە خۆمانو دەوروبەرمان زیاتر بناسینو باشتر هەڵبسەنگێنین.

**١- کەسانێك کە زوو دێن، بەڵام درەنگ دەگەن:**

ئەم دەسـتەیە لـە مرۆڤەکان بـۆ رووبـەروو لەگەڵ هەر دەرکەوتەو گۆڕانکارییەکی نوێ، خۆیان زۆر ئارەزوومەند نیشان دەدەن، لەگەڵ ئەوەی خۆنەویستانە دەکەونە سەر ئەو رێگایەی کە بڕیارە کاروانی گۆڕانکاری پێدا گوزەر بکاتو تێپەڕ بێت.

ئـەم دەسـتەیە بەهۆی شـێوەو جـۆری بیرکردنەوەیان، تا مەودایەکـی نادیـار لە کاروانەکە دەکۆڵنـەوە، بۆئەوەی خۆیان لەگەڵ گۆڕانکارییەکان جێگیر بکەن، باشترواپە جێگری لە یاساو بنەمادا بۆ ناوەندی رەفتارو گۆڕانکارییە باوەکانیش بگوازنەوە.

ئەوان وا بیردەکەنەوە کە هەرچی توندو بەردئاساتر رەفتار بکـەن، رێڕەوی هەناسـە نوێیەکان زۆرتر دەگـرن، بەو مانایە کە هەرچی خۆیان خۆڕاگرتر نیشان بدەن، برستو هەناسەی گۆڕانکارییە تازەکان زیاتر دەبڕن.

چونکـە داخسـتنو دواخسـتنی رێگاکانـی گۆڕانـکاری لە هەرشـتێکدا بـە یەکێـك لـە رێگاکانـی رووبەڕووبوونەوەی گۆڕانکاری دەزانن.

وابیردەکەنـەوە کـە دەبێـت بـە هەمـوو هێـزو تواناوە دەسـتبگیرێت بەو شـتانەی کە لە ئێستادا هەیە رەها نەکرێن، بێئاگا لەوەی کە قافڵەو کاروانی گۆڕانکاری بە مەبەستی ئەوان نەجوڵاوەو نەکەوتۆتە رێ، هەتاکو بمێنێتەوە، بەڵکو رێگایەکە کە دەبێت تەی بکرێت.

ئـەم کۆمەڵـە دیسـانەوە بەهـۆی ئـەو هـۆشو جـۆری بیرکردنەوەی کە هەیانە فەلسـەفە لێـدەدەن بۆئەوەی خۆیان تێگەیشـتوو پەسەندتر نیشـان بدەن، هەوڵیش دەدەن کەسانی تریـش لە راسـتیو رەوابوونی بیرکردنـەوەو رەفتاری خۆیان بگەیەنن‌و ئاراستە بکەن.

ئەمانە بەناوی سەربازو دیدەوانی دژە ئاراستەی گۆڕانکاری هەڵسوکەوت دەکەنو بڕوایان وایە کە ئەزموونو رێگاچارەکانی

دوێنێو ڕابردوو، بۆ ئەمڕۆو ئایندەش بەسە، ئەگەر حەزو تامەزرۆییەکان لە بارەی گۆڕانکارییەکانو چاوپێکەوتنی دەرکەوتە نوێیەکان خستۆتە ڕوو، تەنها لە ڕووی تێبینیو وەرگرتنی زانیاریو هەروەها سەربزێویان بووەو هیچی تر.

بەشێك لەم دۆستانە لەگەڵ باسەکەدا ڕووبەڕوو نابنەوە، ئەوان خۆنەویستانە بارێك لە بارودۆخی نوێیان تاقیکردۆتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی لە ڕێی ڕێگاودۆخی پێشتر نانێکیان دەستدەکەوێت، هەربۆیە دوێنێ لە ئەمڕۆ بەباشتر دەزانن. قسەی خۆشو پەندو ئەزموونی ئەوان لە دوێنێو لە گفتوگۆکردن لەگەڵیاندا، تەنها ئەوەیە: فلان کەس یادی بەخێرو خوا لێی خۆش بێت! ئەو سەردەمە چ هەواڵو ڕووداوێك نەبوو کە ڕوونەداتو نەیبیستین.

ئەمانەی سەرەوە سەرتاپا مانای قسەو باسو سەرگوزشتەی کەسانێکن کە ئەگەر زووش بێن، درەنگ دەگەن، ئەمانە تا سەرو زللەیەك بە دەستی گۆڕانکارییەکانو داهێنراوە نوێیەکان نەخۆن، هۆشو هەستیان نایەتەوە جێی خۆیو بەخەبەر نایەن، کاتێك بە ئاگا دێنەوە دەبینن دواکەوتوونو درەنگ گەیشتوون.

٢- ئەو کەسانەی درەنگ دێن، بەڵام زوودەگەن!

بێگومان لەگەڵ کۆمەڵە کەسانێکدا ژیانو ڕووبەڕووبوونەوە کە دووچاری گرفتی زۆرنو فشاری خەمو سەختی دەستخستنی خەرجو دەرامەتی ڕۆژانەو هەروەها دژواریو نارەحەتییەکانی ژیانێکی پڕ لە ناسۆرو ئازار، زۆرێك لە ئەوانی لە ئاگاداربوونی ڕووداوەکانی تری ژیان بێ ئاگا کردووە، ئەم دەستەیە کەسانێکن کە ڕەنجدەرو زەحمەتکێشو خاوەن هیممەتی بەرزن، بەڵام لەبەرئەوەی لە پێگەیەکی تایبەتی کۆمەڵایەتیو بارودۆخێکی سەختدان، زوو ئاگاداری گۆڕانکارییەکان نابن، بەڵام هەر لەگەڵ ئەوەی پریشکی گۆڕانکارییەکان بینی، بە ئاگا دێنەوە کە دەبێ هیممەت بدەنو جموجوڵێ بکەن، ئەم کۆمەڵە کەسانێکن لەوانەیە درەنگ بێن، بەڵام زوو دەگەن، هەوڵدەدەن بەوەی کە ئەگەرچی ناتوانن سەرقافڵەی شەپۆلی گۆڕانکارییەکان بن، بەڵام دەتوانن لە هاوڕێیی بوونی دوانەکەون.

٣- ئەو کەسانەی کە هەرکات بێن، هیچ کات ناگەن!

ئەم گروپو تاقمە دژە ئاراستەو ڕەشبینن، ئەوان هەوڵدەدەن لە هەر شوێنێکو لە هەر جێگەیەکدا بن، کاری دژو پێچەوانە ئەنجام بدەن، لەوانەیە بۆ ئەو کارەیان گرێبەستو یاساو ڕێسایەکیشیان هەبێت، بۆئەوەی بە پێچەوانەوە کاربکەنو بەرهەمیان هەبێت.

ئەوان خۆر بە ڕەشی دەبینن، شەویش بە چێژو پاروویەکی چەور دەزانن، پسپۆڕن لە پیلانو ڕێگاکانی ڕەنجاندنو دەستو دڵساردکردنەوەی بەرامبەرەکانیان، ئەگەر بڕیار بێت لەگەڵ شەپۆلێکی نوێی داهێنراوە تازەکان ئاشنا بن، درەنگ، یا زوو ئاشناکردنی ئەوان ئەنجامێکی وەهای نابێت، چونکە ئەوان هەر بە پێچەوانەوە کاردەکەنو سازی خۆیان دەژەنن..

ئەگەر کەسێکتان بینی لەم دەستەیە، لە گۆشەیەکدا دانیشتووەو بە سەیرکردنێکی نەزانانە لە ئێوە کە بە شەوقو دڵخۆشییەوە هەوڵدەدەن، تا هەوارو هەناسەیەکی تازەی ژیانی بۆ بگوازنەوە دەڕوانێت. ئەو کات ڕستەی (ئازیزم هیچ کارم بەسەر ئێوەوە نییە)، باشترین وەڵام دەبێت کە دەتوانیت پێیان بڵێیت.

لە ڕیزی ئەم دەستەو کۆمەڵەدا کەسانێکی تر هەن کە بەردەوام بە ناوی ڕەخنەگرەوە ڕاوبۆچوونی خۆیان دەخەنە ڕوو، کە کەمێك ڕاوبۆچوونەکانیان شیدەکەینەوە، تازە تێدەگەین کە ڕەخنەو بۆچوونەکانیان لە ڕووی دڵسۆزییەوە نییە، بەڵکو باسەکە شتێکی ترە، بە واتایەکی تر جۆری ڕەخنەکانیان لە ڕووی ئیرەییەوەیە نەك دڵسۆزی، لە بارەی ئەم کەسانەوە ڕێوشوێنە ئەمنییەکان بە هەند وەربگرن.

لە بنەڕەتدا ئەمجۆرە کەسانە بە هەر جۆرە جموجوڵو گۆڕانکارییەك ڕەشبینن، ئەوان لەو باوەڕەدان کاتێك کە دەتوانین دانیشین، ئیتر بۆچی بووەستینو بجوڵێین؟ فەلسەفەی جووڵەو هەنگاو هەڵگرتن دەخەنە ژێر پرسیارەوە.

ئەوان وەك ئەوەی بە دانیشتنەوە هاتبنە دنیاوە، زۆر هەوڵ بدەنو هیممەت بدەنە خۆیان بە شێوەی چەماوەیی دەژین، کاتێك سەیریان دەکەیت شوێنی کەسێك لە تەنیشتیانەوە بۆ دەستگرتنیان بە بەتاڵی دەبینی، بە کورتی دەست ئاوێزانی هەموو کەسو هەموو شتێکی ژیانن.

٤- کەسانێك کە هەر کات بێن درەنگ، یا زوو، گرنگ نییە چونکە زوو دەگەن:

ئەم دەستەیە لە مرۆڤەکان هەر ئەوەندەیان بەسە کە بگەن بە سنوری ناسینو جیاکردنەوەی ڕاستیو ناڕاست، دروستو نادروست لە یەکدی، ئیدی بە سانایی بەسەر شەپۆلی گۆڕانکاری دەکەونو لاپەڕەی هیواو ئاواتەکانی خۆیان بەوەی کە شیاوی بەکارهێنان بێت ڕەنگین دەکەن، ئەوان دەزانن کە مرۆڤ بوونەوەرێکە، کە لە باری گۆڕانو گەشەو بەرزبوونەوەدایە، کەواتە چ باشتر لەوەی کە هەر کات باسو بابەتێکی نوێیان بەرچاوکەوت، بە سانایی بە لایدا گوزەر نەکەن!

ئەمجۆرە مرۆڤانە بە پێوە دێنە نێو ژیانو لە دایك دەبن، لە باری ئامادەباشیدان، لە نێوان پانتاییو بەرزایی ئاکارو هەڵسوکەوتیان ون دەبێت.

لەوانەیە زۆر نەمێننەوەو نەژین، بەڵام هەر چەند کە هەبن واتای هەوڵدانو ڕاستیو ئیرادەی ڕاستەقینە مانا دەکەن، ڕاستەقینەیەکی نەگۆڕو جاویدان کە لەو دیوی هەر بزاوتنو گۆڕانکارییەوەیە.

بونیادی کەسایەتی وەها کەسانێك هاوزادە لەگەڵ گەڕانو دۆزینەوەی مافو ڕاستییەکان. ئەوان دەزانن کە مافو ڕاستی بەو مانایەی هەر شتێك لە شوێنی شیاوی خۆی دابنرێت.

ئەم کەسانە سەرمەشقێکی شیاوو زۆرجوانن بۆ ژیان، ئێمە بۆ ئەوە نیگەرانین کە درەنگ، یان زوو گرنگ نییە، بەڵام ئەگەر بێتو منو ئێوە لەگەڵ ڕاستییەك ڕووبەڕوو ببینەوە، تا چ ئەندازەیەك دەتوانین شوێنکەوتووی بیرکردنەوەو ڕێگایەکی پەرتو ناسۆ نادیاری ژیانمان بگۆڕینو چارە بکەین، لەگەڵ ئاراستە ڕاستو خوازراوەکەی ئەو ساتو وەختەی چاکسازیو گۆڕانکاریدا بڕینو هاوهەنگاوبین.

وادەبینرێت کە دەتوانرێت لەسەر بنەمای ئەم نموونەیە، مرۆڤەکان لە ڕووی چۆنییەتی ڕووبەڕووبوونەوەو بە دەمەوە چوونی پێشهاتە نوێیەکان، بناسرێنو پۆلێن بکرێن.

چیا عەبدوڵا




# بیرکردنەوەت بگۆڕە، ژیانت بگۆڕە

## جۆری بیرکردنەوەت بگۆڕە:

یاسایەك هەیە لە زانستی دەروونناسیدا دەڵێت: (گەر کەسێك وێنەیەك لە زەینیدا دروستبکات، سەبارەت بەوەی کە دەیەوێت ئەنجامی بدات، پاشان ئەم وێنەیەی پاراستو هۆگری بوو، بۆ کاتێکی دیاریکراو، ئەوە دەبێتە ئەوەی کە خەیاڵی کردووە) ویلیام جیمس...

ژنێکی تەمەن سی ساڵ هەبوو خاوەن ماڵو دایکی دوو منداڵ بوو، هەروەك زۆرینە لە ماڵێکی پڕ لە ڕەخنەو سەرزەنشتکردنی بەردەوامو مامەڵەی توندا گەورە بووە، دەرەنجامی ئەوەش هەستی بێڕێزی، بێ متمانەییەکی توندو قوڵی لادروست بووە، ئەم ژنە بەردەوام پڕبوو لە بیرۆکەی نەرێنی، هەستی بەترس دەکردو بە تەواوەتی متمانەی بەخۆی نەبوو، زۆر شەرمن بوو خۆی لە چاوی خەڵك دەشاردەوە، وا خۆی نەدەبینی کە بەهایەکی هەبێت لە ژیاندا، بگرە وایدەزانی کە لەم ژیانەدا خاوەنی هیچ بەهرەیەك نییە، ڕۆژێکیان لەو کاتەی کە دەچوو بۆ بازاڕ، کاتێك لە ترافیك وەستابوو، ئۆتۆمبێلێك گڵۆپی سوری تێپەڕاندو زۆر بەتوندی خۆی کێشا بە ئۆتۆمبیلەکەی ئەمدا، کاتێك چاوەکانی کردەوە خۆی لە نەخۆشخانە بینییەوە، کە توشی لەرزینی مێشكو لە بیرچونەوەی تەواو ببوو، بەڵام هێشتا دەیتوانی قسە بکات، هاوکات وردەکاری ژیانی ڕابردووی بە تەواوەتی لەبیرچوبووەوە، لەسەرەتاوە پزیشکەکان وایانزانی ئەمە حاڵەتێکی کاتییە، بەڵام چەند هەفتەیەك تێپەڕیو هیچ ئاسەوارو دیاردەیەکی بیرەوەری نەبوو بۆی بگەڕێتەوە، ڕۆژانە هاوسەرو منداڵەکانی سەردانیان دەکرد، بەڵام نەی دەناسینەوە ئەم بارەی بەلای پزیشکەکانەوە دیاردەیەکی ناوازەبوو، بگرە پزیشکانی تریش دەهاتن بۆ لێکۆڵینەوە لەو بارەوە پرسیاریان لێدەکرد..

## سەرەتایەکی نوێ:

لە کۆتاییدا گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی، بەڵام بە یادەوەرییەکی تەواو خاڵییەوە، بڕیاری دا لەو بارەی خۆی تێبگات، لەبەرئەوە دەستیکرد بە خوێندنەوەی پەرتوکی پزیشکی، بەتایبەت ئەو پەرتوکانەی تایبەتە بەبواری یادەوەریو جۆرەکانی، چاوی بە چەندین پسپۆر کەوت لەو بوارەدا، لەگەڵیان دەدوا، تا لە دواییدا لێکۆڵینەوەیەکی وردی خستە بەردەست، سەبارەت بەو حاڵەتەی خۆی، کاتێکی کەم بەسەر ئەم بارەدا تێپەڕی، تا بانگهێشتکرا بۆ کۆنگرەیەکی پزیشکی تا لێکۆڵینەوەکەی باس بکات سەبارەت بە بیرچوونەوە، لەو ماوەیەدا شتێکی نایاب ڕوویدا، ئەم ژنە بە تەواوەتی بوو بە کەسێکی نوێ، ئەو هەموو گرنگی پێدانەی کاتێك لە نەخۆشخانەبوو پێیان دەداو ئەو بانگهێشتو گوێلێگرتنە لەلایەن دەوروبەرەوەو وای لێکرد هەست بە بەهاو گرنگی خۆی بکاتو هەست بە خۆشەویستی خێزانەکەی بکات، دوای ئەوەش گرنگیدان پێی لەلایەن پزیشکەکانو پێشوازیکردن لە لێکۆڵینەوەکانی وای لێکرد ئاستی ڕێزی خودی بەرز بێتەوەو بوو بەکەسێکی ئیجابی زۆر نایاب، متمانەی بەخۆی هەبوو، مامەڵەی خۆشبوو، زمانێکی پاراوی هەبوو، ئافرەتێکی ڕۆشنبیربوو، زۆرجار وەك وتەبێژێكو نموونەیەکی زیندوو بۆ کارە پزیشکییەکان بانگهێشتدەکرا.

هەموو یادەوەرییە تاڵەکانی منداڵی سڕایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەستکردن بەکەمیشی نەما، بوو بەکەسێکی نوێ، جۆری بیرکردنەوەی گۆڕی، جۆری ژیانی گۆڕا.

سەرچاوە: غیر تفکیرك غیر حیاتك، (برایان تریسی)



ئا: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

# شەپقەی پیاوە زاناکە

دەگێڕنەوە جارێکیان زانایەك بە ڕێگایەکدا دەڕوات، لە ناکاودا دزێك شەپقەکەی سەری لێ دەدزێتو وەك ڕەشەبا ڕادەکات، زاناکە هیچی بۆ نەکرا تەنها ئەوە نەبێت دوای دزەکە بکەوێتو بڵێت: پێشکەشم کردیت، بڵێ قبوڵم کرد، پێشکەشم کردیت بڵێ قبوڵم کرد...، زاناکە هەستی بەوە کرد کە پێویستییەکی زۆر وای لەو کەسە کردووە کە تاوانێکی وابکاتو شەپقەکەی لێ بدزێت کە نرخەکەی نەی دەکردە پێنج درهەم، بۆیە زاناکە دڵی بە دزەکە سوتاو ویستی تێی بگەیەنێت کە کڵاوەکە وەك دیارییەك قبوڵ بکات، بۆئەوەی هەست بە نائارامی دەروونو ویژدان نەکات!

ئێمە ئێستا زۆر پێویستمان بەبیرکردنەوەیەکی وەك ئەو زانایە هەیە، پێویستمان بەو شێوە دڵنەرمیو سۆزو بەزەییە هەیە، چونکە زۆربەی ئەو هەڵەو کەمو کورتیانەی لێرەو لەوێ ڕوودەدەن لە کەسانی خراپو دڕندەوە ڕوونادەن، بەڵکو لە کەسانێك ڕوودەدەن کە بە بارودۆخێکی شڵۆقو ناخۆشدا تێدەپەڕن، ملکەچی ئەو بارودۆخە دەبێت، بیرو هۆشو ڕاستی لە دەستدەدات، لە کەسانێکەوە ڕوودەدات کە بە هەڵوێستێکی لاوازدا تێدەپەڕێت بەرامبەر لایەنە وروژێنەرەکان، خەڵکانیش بە هەڵە لەو بارودۆخە تێدەگەن، بۆیە ڕەوشتیان تێکچووە، هەڵوێستیان تێکچووە، بەو شێوەیە پێویستە لاپەڕەیەکی نوێ هەڵدەینەوە، زۆر ئاسانە خەڵکی تاوانبارکەین، گومانی خراپ بەرین، لۆمەیان بکەین، سزایان بدەین، بەڵام زۆر ئاستەمە لە هۆکارە ڕەوشتییە خراپەکان بگەین، زۆر گرانە داوای لێبووردن بکەین، شت لەبیربەرینەوە، لاپەڕەیەکی نوێ هەڵدەینەوە، چونکە ئەو کارانە پێویستیان بە ڕوونیو نەرمیو داهێنان هەیە.

چەندە جوانە هەریەك لە ئێمە خۆمان یەك لابکەینەوە بە وێنەی ئەو زانایەو ئەو لێبوردەییەی، بۆئەوەی لە ناخماندا ماناکانی لێبوردەییو بەزەیی بڕوێنین، ئێمە کاتێك تووشی هەڵەیەکی گەورە دەبین چاوەڕوانی کەسانێك دەکەین کە بۆزشمان بۆ بێننەوە، هۆکارەکانی تووشبوونمان بەهەڵەکان قبوڵ بکەن.

پەیام



# زیرەکی پیرەژن!

پیاوێك بە مەبەستی تێگەیشتنو ئاشنابوون لە زیرەکی ئافرەتان دەستیکرد بە گەشتکردنو گەڕان، دوای گەڕانو ماندوبوونێکی زۆر، لە ڕێگەدا گەیشت بە پیرەژنێکی بەساڵاچوو، کە لای بیرە ئاوێك ڕاوەستابوو، ئەویش لە تەنیشتییەوە دانیشتو کەمێك ئاوی لە بیرەکە خواردەوەو دەستیکرد بە قسەکردن لەگەڵ پیرەژنەکەدا، پیاوەکە وتی: ڕێگەیەکی دوورم بڕیوە، بە مەبەستی ئاشنابوونو شارەزاییم سەبارەت بە زیرەکی ئافرەتان، تۆش ئافرەتێکی بەساڵاچووی، ڕەنگە خاوەنی ئەزموونێکی زۆربیت لە ژیاندا، دەتوانیت پێم بڵێی زیرەکی ئافرەتان چییە؟

پیرەژنەکە هەڵوێستەیەکی کردو بە دەنگێکی بەرز دەستیکرد بە گریان، ئەوەندە دەنگی بەرزکردەوە تا کوڕەکانی گوێیان لە گریانەکەی بێت، ئەو کات بە هەڵەداوان بێن بە دەم دایکیانەوەو واگومانبەرن کە ئەو پیاوە ویستویەتی دایکیان بخاتە نێو بیرەکەوە، ئەوانیش لە تۆڵەی دایکیاندا پیاوەکە بکوژن..

پیاوەکە بەسەرسامییەوە پرسی: چیتە بۆ وادەکەیت؟ بۆ دەگریت؟ زۆر هەوڵیدا لە گریانەکەی ڕایبوەستێنێتو وتی: خۆ من نەهاتووم تا ئازار بە تۆ بگەیەنم!! خراپەیەکم نەکردووە، تەنها پرسیارێکم ئاراستە کردوویت!

پیرەژنەکە بێ گوێدانە قسەی پیاوەکە، سەتڵێك ئاوی لە بیرەکە هەڵکێشاو کردی بەسەری خۆیدا، پیاوەکە بەمکارە زۆر سەرسام بوو، لێی پرسی: بۆچی ئەمەت کرد؟ لەو قسانەدابوون کوڕەکانی بە هەڵەداوان گەیشتنە لای، دایکیان بینی سەرتاپا گیانی شەڵاڵ بووە لە ئاودا، بەڵام پێش ئەوەی کوڕەکان شتێك بڵێن، پیرەژنەکە وتی: کەوتمە ناو بیرەکەوە، ئەم پیاوە منی ڕزگار کرد، ئەگەرنا ئێستا خنکابووم!

کوڕەکان زۆر سوپاسی ڕێبوارەکەیان کردو زۆر دڵخۆشو شادمان بوون کە دایکیان سەلامەتە..

دوای ئەوەی کوڕەکان لە سەلامەتی دایکیان دڵنیابوون، گەڕانەوە سەر ئیشوکارەکانیان، پیاوەکەش لە پیرەژنەکەی پرسی: حیکمەتی ئەم کارەی تۆ چی بوو؟

وتی زیرەکی ئافرەتان ئەوەیە، ئەگەر بەختەوەری بکەیت، شادمانو خۆشحاڵو سەربەرزت دەکات، ئەگەریش ئازاری بدەیت، بە کوشتت دەدات!

من دەمتوانی وا لە کوڕەکانم بگەیەنم کە گریانەکەم بۆئەوە بووە کە تۆ ویستوتە من بخەیتە نێو بیرە ئاوەکەوە، ئەوانیش لە بەرامبەردا بتکوژن، بەڵام وام نیشاندا کە تۆ ڕزگارت کردووم، ئەوانیش لە بەرامبەردا زۆر سوپاسیان کردیت..

ئێستا دەزانیت زیرەکی ئافرەتان چییە؟!

# کام لەم ئاژەڵانە هەڵدەبژێریت؟











هەڵبژاردنەکەت لایەنێك لە کەسایەتیت دەخاتە ڕوو..

- ئەگەر ناچارکرایت بە هاوڕێیەتی کردنی یەکێك لەم ئاژەڵانە (ئەسپ، شێر، فیل، سەگ، پشیلە)، بۆ درێژایی ژیانت، کامیان هەڵدەبژێریت؟

یەکێك لەو ئاژەڵانە هەڵبژێرە، پاشان سەیری ئەنجامەکەی بکە:

١- ئەگەر (ئەسپ)ت هەڵبژارد:

تۆ حەزدەکەیت، خەڵکی پێت سەرسام بن و هەمیشە لە دەورتدا ئاپۆڕای ئەو کەسانە هەبێت، کە پێت سەرسامن و لە ئامادەباشیدابن بۆ هەر کارێك کە داوایان لێدەکەیت، تۆ کەسێکی حەز بە قسەی خۆش و گەشت و سەیران دەکەیت، هەندێجار هەستدەکەیت تۆ تاقانەو بێوینەیت، لە کەسانی تر جیاوازیت، بەردەوام بە دوای کەسێکدا دەگەڕێیت بە قوڵی و زۆربەباشی لە تۆ تێبگات، هەمیشە ئامەزرۆی ژیانێکی ئاسوودەو جێگیرو ئارامیت.

٢- ئەگەر (شێر)ت هەڵبژارد:

خاڵی لاوازیت ئەوەیە کە تۆ نێچیری هەواو ئارەزووەکان و هەست و سۆزو ئەو خۆشییە کاتییانەی کە دێنە سەر ڕێگەت، تۆ لەو باوەڕەدایت کە تائێستا هەلێکی گونجاوت لە ژیاندا بۆ نەهاتۆتە پێش، بەڵام بڕوات وایە کە ئاواتەکانت زوو بێت، یان درەنگ بەدی دێن، تۆ کەسێکی لە ژیانتدا، زۆر بەچاکی ڕووبەڕووی گرفتە گەورەکان دەبیتەوە، بەڵام هەڵسوکەوتت بەرامبەر گرفتە بچووکەکانی ڕۆژانە بە حیکمەت و داناییەوە نییە.

٣- ئەگەر (فیل)ت هەڵبژارد:

تۆ لەوباوەڕەدایت کە ژیان ئەرکەکانی لە خۆشییەکانی زۆرترە، خۆت بۆ هەموو ئەگەرو ڕوداوێك ئامادە دەکەیت، لەبەرئەوە هیچ گرفتێك لەپڕ هەڵناکوتێتە سەرت، سەرکەوتنت هەنگاو هەنگاو بنیات دەنێیت، تا تۆکمەو هەمیشەیی بێت، پێش هەر هەڵسوکەوتێکیش زۆر بیردەکەیتەوە، تەنانەت لەو بابەتانەی کە هەست و سۆز پێیان کاریگەرەو هیچ کەسیش ناتوانێت تۆمەتی سەرەڕۆیی و هەڵەشەیی بداتە پاڵت. لەبەر هەموو ئەم هۆکارانە تۆ دڵت بۆ لای هەموو ئەو کەسانە دەشنێت، کە تەواو لەگەڵتدا پێچەوانەن!

٤- ئەگەر (سەگ)ت هەڵبژارد:

تۆ هێشتا خۆت بە باشی ناناسیت، ئەمەش لە ڕووبەڕووبوونەوەی هەڵوێست و بارە چاوەڕوان نەکراوەکاندا، کێشەو گرفتی زۆرت بۆ دەنێتەوە، چونکە ناژیرانە هەڵسوکەوت دەکەیت و خەملاندنەکانیشت هەرەمەکین..

هیواو سەرقاڵییەکانت زۆر نین، لە هەمان کاتدا خاوەنی زەوقێکی جوانی، حەزدەکەیت کەسێکی شیك و کەشخەو ڕێکوپێك بیت، حەز دەکەیت هەمیشە جلوبەرگی جوان و ئوتوکراوت لەبەربێت، هەروەها خاوەنی هاوڕێی زۆریت.

٥- ئەگەر (پشیلە)ت هەڵبژارد:

تۆ حەز بە هەڵوێستی سەخت و دژوار دەکەیت، حەز بە گاڵتەو گەپو کەین و بەین و گەلەکۆمەکێ دەکەیت، هەندێجار کە لە دۆزینەوەی ئەو کەسانەی وەك خۆت ئاژاوەگێڕن و دەتوانن بتورۆژێنن و هانی بەگەڕخستنی هزرو هۆشت دەدەن، شکست دەهێنیت، هەست بەدڵتەنگی دەکەیت. لە هەمان کاتدا تۆ کەسێکی سەربەخۆیت و حەزدەکەیت لەسەرپێی خۆت بوەستیت، بە دەست بێباربوونی هەوای دڵتەوە دەناڵێنیت، پێویستت بە ژیانێکی پڕ لە چالاکی هەیە، تا تێیدا هەوڵ و تەقەلاو گەشت و گەڕان ئەنجام بدەیت، کەسایەتیشت چەند ڕوویەکی هەیە.

ژیان فێری کردم

مرۆڤ بەبێ ئاکارو ڕەوشتی جوان، وەکو درەخت وایە بەبێ گەڵا، (نە ڕەنگی هەیەو نە تامی هەیەو نەبۆن).

ژیان فێری کردم

شەوەکانی خەمباری هەرچەندە درێژبن، بێگومان ڕووناکی بەختەوەری هەرهەڵدێت، کورد وتەنی (بەری تەنگانە کورتە)!

ژیان فێری کردم

پێنووسو کاغەزو بیرۆکەو زۆر خوێندنەوە، شارێگەی مرۆڤە بۆ داهێنان، بە تایبەت کاتێك مرۆڤ پارێزگاری لە کاتەکانی دەکاتو ڕێگەنادات بەبێ سوود بەسەریدا تێپەڕبن!

ژیان فێری کردم

ئەو مرۆڤەی متمانەو بڕوای بە خۆی هەیەو باوەڕی بە پەروەردگاری هەیە، هەرگیز گوێنادات بە قسەی خەڵکیو گرنگی نادات بە ڕەخنەی کەسانی دۆڕاوو شکستخواردوو، چونکە سروشتی ژیان وەهایە تەنها درەختی بەروبومدار بەردی تێدەگیرێت.

ژیان فێری کردم

مرۆڤ بەبێ هیواو ئاوات، وەکو لاشە وایە بەبێ ڕۆح، ئەو هیواو ئاواتەش کە نایەتە دی، وەکو ئەو خونچەیە وایە کە وشك دەبێت، پێش ئەوەی مرۆڤ چێژ لە بۆنو بەرامە خۆشەکەی ببینێت.

ژیان فێری کردم

نەمری پەیامبەر، بە پەیامەکەیو نەمری زانا، بە زانستەکەیو نەمری فەیلەسوف بە تێڕامانو بیرکردنەوەیو نەمری سەرکردە، بە جەنگە ڕزگاریخوازەکانیو نەمری چاکسازیش، بە هاوڕێکانیەوەیەتی.

ژیان فێری کردم

هەستو سۆز دەوڵەت بنیات دەنێت، هزروهۆشو ژیری پتەوی دەکات، هەواو ئارەزوو دەیڕوخێنێت.

ژیان فێری کردم

عەقڵی فەیلەسوف، دەوڵەت لە هەوادا دروستدەکات، عەقڵی چیرۆکخوان دەوڵەت لەسەر ئاو دروستدەکات، عەقڵی مرۆڤی یاخیو سەرکەش، دەوڵەت لەسەر خەزێنەی باروت دروستدەکات، عەقڵی باوەڕدار دەوڵەت دروستدەکات، ڕەگو ڕیشەی چەسپاوو دامەزراوە، چڵوپۆپی لە ئاسمانە.

ژیان فێری کردم

بەختەوەری خوێن شیرین، ئەو کەسەیە کە ڕووخساری پێدەکەنێت، بەڵام دڵی دەگری، بێ نیازە، بەڵام دەروونی خەمبارە!

ژیان فێری کردم

هاوڕێ سێ جۆرە.. هاوڕێیەك خۆتی پێ دەڕازێنیتەوە، هاوڕێیەکیش سوودی لێدەبینیت، هاوڕێیەکیش پشتی پێدەبەستیت، ئەگەر وێنەی ئەم سێ جۆرە هاوڕێیەت دەستکەوت، ئیدی بە دوای کەسی تردا مەگەڕێ، چونکە لەوە باشترت دەستناکەوێت!

ژیان فێری کردم

ستەم سێ جۆرە، ستەمێك مرۆڤ لە خودی خۆی دەکات، ئەوەیە کە ئامۆژگاری خۆی ناکات، ستەمی مرۆڤیش لە نەتەوەکەی، ئەوەیە کە خزمەتی ناکات، ستەمی مرۆڤ لە ڕاستەقینە ئەوەیە کە دان بە پەروەردگاریدا نەنێت! هاوەڵ دانانیش بۆ خودا، گەورەترین ستەمە!

ژیان فێری کردم

هەرگیز لە ستەم لە لاوازەکان مەکە، چونکە ئەو کەسانە ستەمت لێدەکەن کە لە تۆ بەهێزترن!

ژیان فێری کردم

بەرامبەر بە هیچ کەسێك ڕقو کینە لە دڵ مەگرە، چونکە ڕقو کینە زیاتر لە دوژمن زەبرت پێدەگەیەنێت، ڕقو کینە هاوڕێکانت لێ دووردەخاتەوەو دوژمنەکانیشت لێ نزیك دەکاتەوە، خراپەو نهێنییە شاراوەکانت ئاشکرا دەکات، لە ڕیزی ژیرمەندانەوە دەتگوێزیتەوە بۆ ڕیزی دەبەنگو نەزانەکان، وات لێدەکات بە دڵێکی ڕەشو ڕووخساری زەردو خەماوییەوە بژیت..

**گفتوگۆی نێوان مەڕو گورگ**

گورگ بە مەڕی گوت: متمانەم پێ بکە، دەتبەم بۆ لەوەڕگەیەکی زۆرخۆش.

مەڕەکە گوتی: بە چاوی خۆم ئێسقانی هاوڕێکانم دەبینم..

گورگەکە وتی: ئەوانە من نەمخواردوون، گورگەکانی تر ئەو کارانەیان کردووە..

مەڕەکە گوتی: ئایا تۆ لە سروشتی گورگی خۆت داماڵراویت، تا ئەو کارە نەکەیت کە ئەوان کردوویانە؟!!

# ژیان فێری کردم

# ئیرەیی... پەشیمانیو ئازاری دەروونی کردە بەشێك لە ژیانم

لە کاتێکدا لە کەعبەی پیرۆز بووم، چاوم بە ئافرەتێکی بە تەمەن کەوت، زۆر بە کوڵو بە جۆش دەگریاو دەپاڕایەوە، منیش خۆم پێ ڕانەگیراو چوومە لایو لێم پرسی: دایە گیان بۆچی دەگریت؟ بە چاوێکی پڕگریانو دڵێکی شکاوەوە وتی: بۆ ئازاری دەروونم دەگریم!

وتم لەبەرچی؟ هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وتی: منو هاوسەرەکەم زۆر یەکترمان خۆشدەویست بە جۆرێك ببووە داستانێكو هەمووان بە پەرۆشەوە باسی پەیوەندی منو ئەویان دەکرد، بەڵام شتێك منی نیگەران کردبوو، چونکە بێبەش بووم لە نیعمەتی دایکایەتی، بە ئاواتەوە بووم خوای گەورە کۆرپەیەکمان پێ ببەخشێ، بەڵام بێهودە بوو، هەربۆیە داوام لە هاوسەرەکەم کرد، ژنی دووەم بخوازێت تا ئەو بتوانێت نەوەیەك بخاتەوە، هەرچەندە سەرەتا هاوسەرەکەم ڕەتی کردەوە کە بە هیچ جۆرێك کاری وا ناکاتو بیریشی لێناکاتەوە، بەڵام من وازم نەهێناو سووربووم لەسەر داواکەم، تا ئەویش ڕەزامەندی نواند، پاش چەند مانگێك ژنی دووەم دووگیان بوو، خوای گەورە کوڕێکی پێبەخشین، هاوسەرەکەم زۆر دڵی پێخۆش بوو، تا وای لێهات هەستم دەکرد زۆرگرنگی بە ژنەکەی تری دەداتو خۆشەویستی بۆ ئەو زیاتر بوو، ئەمەش وای کرد من هەستی ئیرەییم لا دروست ببێت بەرامبەریو زۆر نیگەرانی کردبووم.

ڕۆژێك هاوسەرەکەم هاتو پێی وتم: لەگەڵ هاوسەری نوێم گەشتێك دەکەینو منداڵەکە لای تۆ بەجێدەهێڵین! بەبێ هیچ گفتووگۆکردنێك وتم باشە، چونکە بێجگە لە من کەسێك نەبوو بیگرێتە خۆی، بۆیە ڕەزامەندیم نواند لای من دایبنێن.

لە یەکەم ڕۆژی گەشتەکەیان بوون، منداڵەکەش لەبەر دەممدا یاری دەکرد، ئەو ڕۆژە زۆر سارد بوو ئاگردانم کردبووەوەو منداڵەکەش بەرەو ئاگردانەکەچوو، بە دەستە بچووکەکانی پارچە خەڵوزێکی هەڵگرت بەپەلە بەرەو پیری چووم تا لە دەستی فڕێدەم نەوەك بسووتێ، بەڵام ئاگری ڕكو کینە لە ناخمدا گەشابووەوەو دەیخواردم! منیش لە بری ئەوەی لە دەستی بسەنم بەڵکو دەستیم خستە ناو ئاگردانەکە تا ئاگری ناخم کەمێك کەمبووەوە، بەڵام هەر نەکوژایەوە، دەستی ناسکی بە جۆرێك سووتا بە هیچ شێوەیەك جێگەکەی ساڕێژ نەدەبوو، هەربۆیە دەستی شێوەی سروستی خۆی لە دەست دا.

پاش کاژێرێك لەو ڕووداوە هەواڵم پێگەیشت هاوسەرەکەمو ژنەکەی بەهۆی کارەساتی ئۆتۆمبێل گیانیان لە دەست داوە! تەنها منو منداڵەکەماینەوە! بەخێوم کردو زۆرم خۆشدەویست بەهەمان شێوە ئەویش زۆر خۆشی دەویستم، گەورەبوو، چاودێری منی گرتە ئەستۆی خۆیو زۆرگرنگی پێدەدام، ئەوەش ئازاری دەروونی دەدام، بەتایبەتی کە بە دایە گیان بانگم دەکاتو سۆزی خۆیم بۆدەردەبڕێ، لەو ساتانەدا دڵم دەگوشرێو دەروونم ئازارم دەدا، بە تایبەتی کاتێك بە دەستێکی سوتاوەوە کە من هۆکاری بووم هەموو داواکارییەکانم جێبەجێ دەکات، دڵم پڕگریان دەبێتو دەڵێم ئەگەر من ئەو منداڵەم لەگەڵ نەبوایە دەبوو لە چ حاڵێکدا بوومایە!

زۆربەی جار ڕووداو، یان بەسەرهاتێك دێتە ڕێمان، بیرلەوە ناکەینەوە کە ئەمە بێ حیکمەت نییە، هەربۆیە دەست بە گلەییو گازندە دەکەینو ناڕەزایی دەردەبڕین تا ئەو کاتەی کار لەکار دەترازێو پەشیمان دەبینەوە، پەشیمانیش هیچ دادێکمان نادات.

ئا: پێگەرد فارس



# منداڵێکی جوان..

ئالانی

لـە یەکێك لە چیرۆکـە دێرینەکانی چینییەکاندا هاتـووە، خێزانێك خودا منداڵێکی جوانیان پێدەبەخشـێت، خزمو دۆسـتانو دراوسـێکانیان بۆ پیرۆزبایی‌و دەربڕینی شادی‌و خۆشـحاڵی خۆیان سـەردانی ئەم خێزانە دەکەن، هەر یەك لەوان بە جۆرێك ڕاوبۆچوونو خۆشحاڵی خۆیان بۆ خێزانو ئایندەی منداڵەکە دەردەبڕن..

دراوسـێی یەکەم: سـەردانی ئەم خێزانە دەکەنو دیارییەکی جوان پێشکەشـی منداڵە چاوگەشـەکەیان دەکەنو بە بینینی زۆر خۆشـحاڵو ئاسـوودە دەبـنو دەڵێن: ئای چەند منداڵێکی جوانو خوێن شـیرینە، بێگومان لە ئایندەدا دەبێتە سـەرکردەیەکی بەناوبانگو لێهاتوو..

دایكو باوکی منداڵەکە بە بیسـتنی ئەم قسـانە زۆر شادمان بوون، زۆر زیاتر سوپاس‌و ڕێزو خۆشەویستیان بۆ دراوسێکەیان دەربڕی‌و خواردنو شەربەتو میوەیان پێشکەشکردن، دواتر بە خۆشحاڵیەوە ماڵاواییان لێکردن..

بـۆ ڕۆژی دواتـر دراوسـێی دووەمیان سـەردانی کـردنو لـە ناخـەوە پیرۆزباییان ئاراسـتەکردنو بە دیتنی منداڵەکەیان سەرسـامی‌و خۆشحاڵی خۆیان نیشانداو وتیان: ئای چەنـدە منداڵێکـی جوانـە، بێگومان ئەم منداڵە جوانو ڕۆح سـوکە دەبێتـە بازرگانێکی دەوڵەمەندو کەسایەتییەکی بەناوبانگ..

باوكو دایکی منداڵەکەش زۆر سوپاسـی هەسـتی بەرزو ناوازەیان کردنو ڕێزی زۆریان لێگرتنو خواردنو شـیرینی‌و میوەیان پێشکەشکردنو ساتێکی خۆشیان پێکەوە گوزەراندو پاشان بەڕێزەوە ماڵاواییان لێکردن..

بۆ ڕۆژی دواتر دراوسێی سێیەمیان سەردانیکردن، لە کاتی بینینی منداڵەکەدا لەجیاتی پیرۆزبایی وتی: بێگومان ئەم منداڵە لە ئایندەدا ماڵاوایی لە ژیان دەکاتو دەمرێت!!

باوكو دایکی منداڵەکە بە بیسـتنی ئەم وتەیە زۆر پەسـتو نیگەران بوون، هەربۆیە دەسـتیانکردە لێدانیـانو هەر بە پاڵ دراوسـێکەیان کـردە دەرەوە، تەنها لەسـەر ئەوەی ڕاستییەکی وتوە!

چونکە گومان لەوەدا نییە هەر کەس لە دایك بێت، دەشمرێت ئەگەر دوای سەد ساڵیش بێت..

بـەڵام تاوانی ئەم دراوسـێیە تەنهـا ئەوەبوو کە نەدەبوو لە کاتی ئەوپەڕی خۆشـی‌و شادیدا بە قسەیەکی لەو جۆرە ئەگەرچی ڕاستو دروستیش بێت، هەستیان بریندار بکاتو نیگەرانیان بکات..

کەواتە پێویستە هەر شتێك، یان هەر وتەیەك لە شوێنو کاتی شیاوی خۆیدا بگوترێت.. ناشـێت لە کاتی شادیدا بە گریان پیرۆزبایی لە بەرامبەر بکەینو لە پیرۆزبایی منداڵێکی تـازە لـە دایکبـوودا مردن یادی دایـكو باوکی بهێنرێتـەوەو لە کاتی خەموپـەژارەدا بە پێکەنینـەوە هاوخەمی خۆمـان دەربڕین، زۆرجار دەبینین لە کاتی پرسـەداو لەو کاتەی کە خاوەن پرسـە لەوپەڕی نیگەرانی‌و بێتاقەتیدایە، دۆسـتانو میوانانی دوو دوو سەریان کردووە بەسەری یەکداو قسەی خۆش‌و پێکەنیناوی بۆ یەکتری دەگێڕنەوە..

هەموو شتێك، یان هەموو وتەیەك شوێنی شیاوی خۆی هەیە..



محەممەد ئیسماعیل



# هێزی وشەیەك بێهێزی كردم..

جوانی دەریاو رووبارەكانی دونیاو شەپۆلە شادیی بەخشەكانو ئاسمانی رەحمەت رێژو پەپوولەی جوانی بەخشو گوڵی ئاشتیو چاوی تامەزرۆییم، وا لە بەهاری تەمەنیدایە..

وشە ناسكو ئاوازدارەكانمو دەنگە زوڵاڵەكەی شەوانی تارییو غوربەتی دووریمو موناجاتی حەبیبو مەحبوبم، لە خەڵوەتداو شێتو ونبووم لە ناو جەمعو یاراندا..

عاشقو مەجنوونی دەمێكم، كە قەتعییەن چاو ناتوانێ خۆراگرو بەهێزبێت، بۆ دەربڕینی تەنها پیتێكی وشەی كورتی جەوامعی كەلیمو ئاوازی مەزامیری داوودو بەلاغەتی نالیو مەحووی..

هەر رەوانشناسێ بیەوێ یەك وشەی شیبكاتەوە، ئەوە وشەكە شلۆقو بێ مانا دەكاتو ناتوانێ تەنها پیتێكی ئەو فەحلەی سەر زەوی خوڵقێنەر وەك خۆی بڵێتەوە..

منی بچوكو جوانی ناو ئەم گەردوونە شێتو شەیداو مەجنوونو صوومو دەنگبڕاوی، یەك وشەیەكی ئەو جەوامیعەم، كە نە دەتوانم دووپاتی بكەمەوەو نە دەتوانم دەستبەرداری بم، مەگەر مەرگی خۆم بەدەستی خۆم ببینم..

شاهی سەر زەوییە ئەوەی مۆڵەتی وتنەوەی وشەی ئەوی پێ بدرێتو خۆی لەوانە دابنێ كە مەجنوونی لەیلایەك بووە، كە هەر بە بیستنی ناوی بەنجو سڕ ئەبێتو ئەداتی بیركردنەوەی لە وشەی (إشتقت لإخواني) بۆ هەتاهەتایی موڵەتی بێكاری پێ دەدرێتو دەبێتە مەجنوونێك كە كەس ناتوانێ لە گەردوونی بێ تەئەممول، بگاتە ئەو پلە جنونە..

ئەوە چۆن بوو؟؟ مرۆڤێك نییە لە ئاستی شەوقیو مەولەوی رێگای حەقیقەتو تەریقەت، توانی ئەو فەحلەی ناو وشەكانی سەر زەوی تەللەفوزو نوتق بكاتو هەر ئاگاشی لە خۆی نەبێ، چۆن وشەكەی وتوەتەوە..

ئێستا من چی وەڵامێكی بدەمەوە كە پێم دەڵێ: (إشتقت لإخواني) بە دیاری پێمداویتو منیش هیچ نازانمو لاڵو بێ وشە ماومەتەوەو شەرمەزار خۆم، خۆ نالی رەوانشناسم لا نییە تا هیچ نەبێ یەك دیوانی بۆ نوسیبامەتەوە تا لەبەرمكردایەو بەڵكو وەڵامێك بوایە بۆ ئەو دێڕە كە تازە من فێربوومو ئەبێتیش وەڵامی منی بێ ئەزموونی بۆ بێت، ئەگینا واوەیلا بۆ خۆم..

ئەگەر هەموو دیوانەكان بێنمو شی بكەمەوەو دایبنێم لە تەرازوی دڵسۆزیو راستگۆیی، هیچ ناتوانێ بگاتە دەربڕینی پیتی(یائی) (إشتقت لإخواني)، بۆیە منیش هیچ نازانم هیچ.. تەنها ئەوە نەبێت بڵێم شەرمەزارم، ناتوانم وەڵامم هەبێت لە كزۆڵیو جاهلیم لە حزووری تۆ، كە مەجنوونو مەفتونی تۆم بۆ ئەو شەرەفە.. لە بەرامبەر ئەو دێڕە چی بڵێم؟ كە بە من ئەڵێی تامەزرۆی لیقای براكانمم، چونكە هۆگری من بوونو منیان بەو هەموو جوانیو جەمالی یوسفەوە نەبینیوەو ئاواتی گیان لەدەستدانی خۆیان ئەخواست، كە هیچ نەبێ بەس یەك چاوتوركانو لەحزەیەك چاویان بەو جەمالە بێ هاوتایە بكەوێ..

شەرمەزار خۆم، من چی بڵێم بۆ ئەو هەموو راستگۆییو سۆزو موحیببەتی.. بۆ لاتە مرۆڤێكی ئەم سەرزەمینەو لە پاڵ دەریای عیشقو عیرفان، چی قورێ بگرمە خۆم، كە هەڵگری تەنها كاسەیەكی ئاوی عیرفانیش نیمو تینووی دیدارێكی ئەو چاوە سیحراویانەم..

گوڵان حەمەئەمین

# شەرم.. هۆکارو چارەسەر

چارەسەری شەرم.. چارەسەری شەرم چەند ڕێگایەکی هەیە، کە ڕەنگە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە بگۆڕێت، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەم ڕێگایانە دەبنە هۆکاری چارەسەری شەرمنیو ڕووبەڕووبوونەوەی شەرمنی لەڕادەبەدەر:

١- متمانەبەخۆبوون: متمانەبەخۆبوون یەکێکە لەو هۆکارانەی کە مرۆڤ بە هۆیەوە دەتوانێت تاڕادەیەکی زۆرباش بەشێك لە شەرمنی پێ چارەسەر بکات، بۆ نموونە کەسێك دیمەنی جەستەو ڕووخساری خۆی لاجوان نییە، ئەمەش هۆکارێکە بۆ شەرمنی، ڕەنگە بەم هۆیەوە نەتوانێت تێکەڵ بە خەڵك ببێت، یاخود کەسێك خاوەنی زانستو زانیاری زۆرە، بەڵام متمانەی بەخۆی نییە، بۆئەوەی بەخەڵکی بگەیەنێت، بۆ ئەم نموونانەو چەندین نموونەی دیکە، متمانەبەخۆبوون چارەسەرێکی ئەفسووناوییەو لە ڕێگەیەوە کەسی شەرمن دەتوانێت چارەسەری شەرمنیو سەرجەم خاڵە نەرێنییەکانی دیکەی بکات.

٢- خۆشویستنی خود: کاتێك مرۆڤ خودی خۆی خۆشبوێت ڕازی نابێت مومارەسەی هەندێ لە حەزو هیواو ئاواتە ڕێ پێدراوەکانی خۆی نەکات، بەڵکو هەوڵدەدات خۆی خۆشتربوێت لەوەی شەرم بکات لە دەوروبەر.

٣- گوێ نەدان بەقسەی خەڵکیو بۆ خۆ ژیان: زۆرجار کەسێك حەز دەکات کارێك ئەنجام بدات، بۆ نموونە حەز دەکات بەیانیان لە پارکێکدا وەرزش بکات، یاخود بچێتە یانەیەکی وەرزشیو ڕۆژانە ڕاهێنانی وەرزشی بکاتو پەرە بە تواناکانی بدات، بەڵام چی وای لێدەکات کە ئەو کارە نەکات، بێگومان ترسان لەوەی خەڵکی گاڵتە بەکارەکەی بکەن، یان حەز دەکات جۆرێك پۆشاك، یاخود ڕەنگ لەبەربکات، بەڵام دەترسێت خەڵکی بەجوانی نەزانن، ئیدی هەموو شتەکانی تر لە شێوازی خانوو کەلو پەلی ماڵو... هتد، دەڵێت: حەزم لەوەش نییە بەڵام عەیبە، خەڵك ئەوە بەکارناهێنن، شەرم دەکات لەوەی وەك ئەوانی دی نەکات. لە هەموو ئەم بارانەدا پێویستە مرۆڤ وا خۆی ڕابهێنێت کە گوێ بە قسەو ڕەخنەی ڕووخێنەری دەوروبەر نەدات، دڵنیابە لەوەی ئەگەر گوێت بۆ ڕەخنە ڕووخێنەرەکان نەگرت، ئەوا دەتوانیت هەم شەرمکردنت چارەسەر بکەیت، هەم بگەیتە لوتکەی سەرکەوتن، بۆ زیاتر ئاشنابوونت سەبارەت بەم خاڵە، دەتوانیت چیرۆکی (گوێ بۆ قسەی خەڵکی مەگرە) بخوێنیتەوە، کە لە ژمارە (١٠) گۆڤاری بڕیاردا بڵاوکراوەتەوە.

٤- خێزانو خانەوادە: هەروەك لە بەشی یەکەمی بابەتەکەدا باسمان کرد خێزانو خانەوادە ڕۆڵی گەورەیان هەیە لە دروستکردنی کەسایەتی مرۆڤدا، جا چ کەسێکی شەرمن بێت، یاخود کەسێکی بێ شەرم، یاخود کەسی هاوسەنگ، پێویستە خانەوادەو خێزانیش هەوڵی ئەوە بدەن کە هاوکاری ئەندامانی خێزانەکەیان بن، بۆئەوەی لەبەر شەرمنی مافەکانیان لە دەست نەدەن، ئەوەش بەشێکی بەوە دەبێت کە ڕووشکێن نەکرێت لەسەر بەدەستهێنانی مافەکانی خۆی، یاخود لەسەر مومارەسەکردنی ژیانی بەو شێوەی کە دەیەوێت.

٥- هەوڵدانی خود بۆچارەسەرو ڕاهێنان: وەك ئەوەی ئەو کارە دروستانە ئەنجامبدات کە بەهۆی شەرمنییەوە ناتوانێت ئەنجامیان بداتو بەسەرخۆیدا زاڵ بێتو بەمافی خۆی بزانێت.

٦- هاوڕێ: هاوڕێیەتی کردنی کەسانێك کە بوێرن لە بەدەستهێنانی مافەکانی خۆیانداو شەرمن نین، تا لە وانەوە فێری بوێریو ئازایەتی ببیت.

٧- دوورکەوتنەوە: دوورکەوتنەوە لەو کەسانەی لۆمەو سەرزەنشتی زیاد لە پێویستت دەکەنو بەرەو شەرمنیت دەبەن.

٨- بەشداریکردن: کاتێك لە کۆڕێك، یاخود لە نێو کۆمەڵو کۆبوونەوەیەکدایت، هەوڵبدە قسەیەکت هەبێت بێئەوەی پرسیارت لێ بکەن، وەك ئەوەی بڵێ کەشو هەوا خۆشە، یان هەرشتێکی دی، گرنگ ئەوەیە بێدەنگیو شەرمنی دانیشتنەکە بشکێنیت.

٩- دەنگ بەرزکردنەوە: لە کاتی قسەکردندا، کەمێك دەنگ بەرز بکەرەوە، کاتێك بە تەنهای وای دابنێ لە ژوورێکدایت کە چەند کەسێکی تێدایەو تۆش قسەیان بۆ دەکەیت، بەوپەڕی متمانەو ڕەوانبێژییەوە.

١٠- جێبەجێکردن: جێبەجێکردنی ئەو چەند ڕێنماییانە دەبێتە هۆی ڕزگاربوونت لە دیاردەی شەرمکردن.

بەشی سێیەمو کۆتایی




و: شاد پێنجوێنی

# کورتەنامە ناردن

گەنجێـك.. دایکە پیرو نەخۆشـەکەی بـە ئۆتۆمبیل گەیاندە نەخۆشـخانە، لەبـەردەم نەخۆشـخانەکەدا دایبەزانـدو لەگەڵیدا نەچـووە ژوورەوە، چونکـە لەگەڵ چەند کەس لـە هاوڕێکانیدا.. بڕیاریـان دابوو: بـۆ گەشـتوگوزار بچنـە هاوینەهەوارێك. کوڕە گەنجەکـە بـە دایکی گوت: دایەگیان، من زۆر سـەرم قاڵە، ئیش‌و کارم زۆر زۆرە، لەبەرئەوە خۆت بەو پلیکانانەدا.. سەرکەوەو بچۆرە بەشی پێشـوازی نەخۆشەکانەوە، لەوێدا پەرستارەکان بە پیرتەوە دێـن‌و یارمەتیـت دەدەن، خزمەتێکی باشـت پێشـکەش دەکەن‌و هەرچی پێویست بکات بۆت ئەنجام دەدەن.

پیرێژنەکە تەماشـایەکی پلیکانەکانـی کردو زەردەخەنەیەکی کرد..

کـوڕە گەنجەکـە بە دلگرانییـەوە گوتی: دایـە، مەگەر چیم گوتووە، وا تۆ پێی پێدەکەنیت؟!

پیرێژنەکە سـەرێکی ڕاوەشـاندو گوتی: ڕۆڵەگیـان.. جەرگی جەرگـم.. دەردت لـە گیانم بکەوێ، بە تۆ پـێ نەکەنیوم.. بەڵکو کەوتمەوە یادی جاران.. بیسـتو پێنج ساڵ لەمەوبەر، ئەو دەمەی تۆ یەکسـاڵان بوویتو باوکیشـت بەشـەو کاری دەکرد، درەنگانی شەوێکیان نەخۆش کەوتیت، تاو گەرمی لەشت زۆر بەرز ببووەوە، ئـەو کات ئۆتۆمبێلمـان نەبـوو.. لەو کاتەی شەویشـدا ئۆتۆمبیل دەسـتنەدەکەوت، ئاگری جەرگ هەڵیگرتـم، ناچار بە پێ هەموو ڕێگەکەم بڕی‌و هەر بەسـەر دەسـتی خۆمەوە، تـۆم گەیاندە ئەم نەخۆشخانەیەی ئێستە تۆ منت گەیاند، بەڵام ئێستە..

پیرێژنەکـە ئەمەی گوتو بە سەرپۆشـەکەی فرمێسـکەکانی سـڕی‌و دەسـتی دایە هەڵگەڕان بەسـەر پلیکانەکاندا، لە پڕ کوڕە گەنجەکە دەسـتی دایکی گرت، پیرێژنەکەش هەسـتی بە دەستی گەرمی کوڕەکەی کردو زەردەخەنە بووەوە بە یاوەری لێوی..

لـەم کاتەدا کوڕە گەنجەکـە مۆبایلەکەی، لە گیرفان دەرهێناو کورتە نامەیەکی بۆ هاوڕێکانی نارد:

(ببـورن، ئێـوە بڕۆن، مـن ناتوانـم لەگەڵتان بێـم.. چونکە گەشـتوگوزارێکی دیکـەم هەیە.. لەوەی ئێوە، زۆر پێویسـتترو لە پێشترە..)

کاتێـك نامەکە گەیشـتە شـوێنی خۆی، دایکەکـەو کوڕەکەی چووبوونە نەخۆشخانەکەوە.

روزهای زندگی: ٣٥٦

# کۆتا نامەی دایکم

و: کلسوم جەلال

لـە ماوەی تەمەنی لاویمـدا، زۆر لەماڵەوە دووردەکەوتمەوەو لـە گەڕانـەوەم بۆ مـاڵ درەنـگ دەکەوتم، ئەمـەش دایکمی زۆر تووڕەو نیگەران دەکـرد، لەبەرئەوەی لە ماڵەوە نانم نەدەخواردو زۆربەی کاتەکانی ڕۆژم بە خەو بەسـەر دەبردو شەوانیش کاتێك دەگەڕامەوە بۆ ماڵ دایکم لە شـیرینی خەودا بوو، دوای ماوەیەك دایکـم لە ناچاریدا پێش خەوتنی لەسـەر سـەلاجەکە نامەی بۆ بەجێدەهێشتم، شوێنی خواردن‌و چۆنییەتی ئامادەکردنی بۆ ڕوون دەکردمەوە، بە تێپەڕبوونی ڕۆژ  نامەکانی دایکم داواکاری تیابوو، بە بیرهێنانەوەی سـەردانە گرنگەکان‌و شـۆردنی جلە پیسەکان‌و دانانیان لە نێو جلشۆرەکەو.... هتد.

بەمشێوەیە ماوەی هەرزەکاریم تێپەڕاند، شەوێك کە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، هەروەك شـەوەکانی تر نامەیەکم لەسـەر سـەلاجەکە بینـی، تەممەڵیم کرد لـە خوێندنەوەی‌و خەوتم، بەیانی سـەرم سـوڕما باوکم خەبەری کردمەوەو چاوەکانی هۆن هۆن ئەسرینیان دەوەرانـد: دایکـت کۆچی دوایی کـرد.. چەند بە ئـازار بوو ئەو هەواڵە!!

دوای تەواوبوونی مەراسـیمی ناشـتنی‌و پرسـەکەی گەڕامەوە بـۆ مـاڵ، بـە دڵێکـی خەمبارو پـڕ لە ئـازار لەسـەر جێگاکەم ڕاکشـام، نامەکـەی دایکمـم بیرکەوتەوە کە لەسـەر سـەلاجەکە بـۆی بەجێهێشـتبووم، بەپەلە چووم بۆ چێشـتخانەکەو نامەکەم لێکـردەوەو خوێندمەوە، زۆر خەمباربـووم ئەمجارە نامەکەی نە داواکاری بوو، نە زانیاری‌و ئامۆژگاری، تەنها نووسرابوو:

"کوڕە ئەزیزەکـەم، زۆر بیرت دەکەم، هیوادارم ڕۆژێك پێکەوە دابنیشین، من دایکتم، لەبیرت کردووە کە دایکت هەیە، من دڵنیام کـە لە ناختدا خێرێکی زۆر هەیەو ڕۆژێك لە ڕۆژان دەردەکەوێت. لەسەرو ئەمانەشەوە من لێت خۆشدەبم‌و خۆشمدەوێیت.... دایکت"

لـە دوای ئەو ڕۆژەوە بڕیارم دا گۆڕانێکی ڕیشـەیی لە خۆمدا دروسـت بکەم، ئیدی بە تەواوی گۆڕام‌و کۆتاییم هێنا بە تەمەنی هەرزەکاری‌و کەللەڕەقی‌و کاری بێ مانا، هەرچەندە درەنگ نامەکەم خوێنـدەوەو نەمتوانی ئاواتو وەسـیەتەکەی دایکم بە زیندوویی بهێنمـە دی، بەڵام نامەکەی دایکم بـووە هۆی دوورکەوتنەوەم لە خراپەو تاوان‌و سەرکەشـیم، ئێستاش بە پێی وەسیەتەکەی دایکم کە دەیویسـت لەگەڵیدا دابنیشم، زۆر سـەردانی گۆڕەکەی دەکەم‌و نزای ڕەحمەتو لێخۆشبوونی بۆ دەکەم!

و: له فارسییەوە: بەرزان ئەبوبەکر

# هاوڕێی نیوەڕێ..



بازرگانێکی دەوڵەمەند، کە خاوەنی تەنها یەك کوڕ بوو، بەڵام کوڕەکەی کەسێکی زۆر بێبەرنامەو بێ پلان بوو، هەمیشە بە دوای کاری خراپو نەشیاوەوە بوو، هاوڕێیەتی کەسانێکی دەکرد کە نە بۆ دنیاو نە بۆ ئاخیرەت بە کەڵك نەدەهاتن، هەموو جارێك باوکی ئامۆژگاری دەکردو پێی دەگوت: هاوڕێیەتی کەسانی خراپ مەکە، چونکە (هاوڕێ لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی)، بەڵام سوودی نەبوو، قسەکانی باوکی لەم گوێیەوە دەبیستو لەو گوێیەوە دەهاتەدەر..

بازرگانەکە زۆر خەمی بۆ حاڵی کوڕەکەی دەخوارد، ڕۆژێك بە خۆی گوت: ئەم کوڕەم ئەوە ڕەفتاری بێو ئەوانەش هاوڕێی بن، لە پاش من دووچاری ژیانێکی سەختو دژوارو ناڕەحەت دەبێت!

ڕۆژێك بازرگانەکە هەزار سکەی زێڕی خستە ناو سەقفی یەکێك لە ژوورەکانی ماڵەکەیداو لەوێدا قایمی کرد، پاشان ڕۆیشت بۆ لای کوڕەکەیو پێی گوت: کوڕی شیرینم، ئەگەر دوای من دووچاری دەردەسەریو ناڕەحەتی بوویتو سەختی ڕۆژگار تەنگیان پێهەڵچنیت، تا ئەو ئەندازەی ئەگەر ویستت خۆت بکوژی، ئەوا گوریسێك بە ئەڵقەی ناوەڕاستی فڵانە ژووردا هەڵواسە، پاشان بچۆرە سەر تەپڵەکێكو گوریسەکە بخەرە گەردنتەوەو تەپڵەکەکە لەژێر پێت لاببە، ئەمجۆرە مردنە لە هەموو مردنێك ئاسانترو باشترە!

کوڕە بازرگان بە قسەکانی باوکی زۆر پێکەنی، لە دڵی خۆیدا وتی: (باوکم شێت بووە، مەگەر مرۆڤی ژیر بە دەستی خۆی، خۆی دەکوژێت، وا باوکم فێری خۆکوشتنم دەکات)!!

ڕۆژان هاتو ڕۆی، قەدەر وابوو بازرگان بۆ دواجار ماڵاوایی لە ژیان کردو بۆ هەمیشە چاوەکانی لێکنان، کوڕەکەی سەروەتێکی زۆری بۆ بەجێما، لەبری کارکردنو برەودان بە سەروەتەکەی باوکی، دەستیکرد بە خەرجکردنو خواردنی، ئەو سەروەتەی باوکی بە درێژایی ژیانی کۆیکردبووەوە، لە ماوەی یەك ساڵدا هەمووی لە پێناوی ئارەزووەکانی خۆیو هاوڕێ نەگریسەکانیدا خەرجکرد، دوای تەواوبوونی دینارو درهەم، کەوتە فرۆشتنی کەلوپەلی ناوماڵەکەیان، ئەمڕۆ فەرشەکانی دەفرۆشتو سبەینێ کەلوپەلی عەنتیکەی دەفرۆشتو ڕۆژێکی تر کۆیلەو ڕۆژی دواتر کەنیزەك.. هتد، هەتا وای لێهات لە ماڵەکەیاندا هیچ شتێك نەما بۆ فرۆشتن!

کوڕە بازرگان نەیدەزانی دوای ئەوە چی بکات!! لەو ساتو کاتەدابوو، هاوڕێکانی هەواڵیان دابوویە، ئەمشەو لە فڵانە باخچە میوانی تۆ دەبین، خواردنمان بۆ ئامادە بکەو وەرە بۆ لامان)..

دوای ئەوەی لە ماڵەکەدا زۆر گەڕا هیچ شتێکی دەستنەکەوت، تا بیبات بیفرۆشێت، ڕۆیشت بۆ لای دایکی، دەستیکرد بەگریانو وتی: (ئەمشەو میوانم هەیە، هیچ شتێکم نییە میوانداریەکەی پێ بەڕێ بکەم، ئەگەر چارەیەکم نەکەیت لەبەرچاوی دۆستو دووژمن ئابڕوم دەچێت)!!

دایکی دڵی بە حاڵی کوڕە تاقانەکەی سوتا، ڕۆیشتە بازاڕو بڕێك لە ئاڵتونەکانی فرۆشتو خواردنی بۆ میوانەکانی کوڕەکەی کڕیو

بەهەر جۆرێ بێت پێداویستی میوانەکانی جۆرکرد، خواردنەکەی بۆ خستە بوخچەیەکەوەو دایەدەستی، تا بۆ میوانەکانی ببات.

کوڕەکەی زۆرخۆشحاڵ بوو، بوخچەکەی هەڵگرتو بەڕێکەوت بۆ ئەو باخچەیەی کە بەڵێن بوو میوانداری هاوڕێکانی تێدا بکات، کەوتە ڕێ، لە ڕێگەدا زۆر ماندووبوو، بوخچەکەی داناو لە ژێر سێبەری درەختێکدا دانیشت، تا پشووبداتو بحەوێتەوەو پاشان دەست بکاتەوە بە ڕۆیشتن. لەو کاتەدا سەگێك بۆ پەیداکردنی ژەمە خۆراکێك سەری کرد بە نێو بوخچەکەدا، کوڕە بازرگانەکە بەردێکی تێگرت، سەگەکە دەستبەجێ بوخچەکەی کرد بە ملیداو ڕایکرد، کوڕەکە زۆر بە خێرایی ڕایکرد بە دوای سەگەکەدا، بەڵام نەیتوانی بە سەگەکە بگاتەوە..

بە دڵێکی پڕ لە خەمو چاوی پڕ لە ئەسرینەوە ڕۆیشت بۆ لای هاوڕێکانیو تەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە، هەموویان دایانە قاقای پێکەنین، کەسیان بە قسەکانی کوڕە بازرگان باوەڕیان نەکرد، دوای ئەوە هەموویان ڕۆیشتن بۆ ئامادەکردنی خواردن، دانیشتنو دەستیان کرد بە نانخواردن، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو، ئەوەبوو کە خواردنیان بە کوڕە بازرگانەکە نەداو نەیانهێشت بچێتە ناویانەوە!! ئا لەو کاتەدا کوڕە بازرگانەکە بە خۆیدا چووەوەو تێگەیشت کە سەروەتو سامانی باوکی بۆ چ کەسانێك خەرج کردووە، هەر بۆیە بڕیاری دا کە خۆی بکوژێت، لە دەستی ئەم ژیانەو ئەو دۆستو هاوڕێ بێ وەفایانەی ڕزگاری ببێت، لەو کاتەدا وەسیەتەکەی باوکی بەبیرهاتەوە کە پێی گوتبوو هەر کات لە ژیان بێزار بوویتو سەختی ڕۆژگار تەنگی پێهەڵچنیتو ویستت خۆت بکوژی، بڕۆ بە ئەڵقەی ناوەڕاستی فلانە ژوورەوە خۆت هەڵواسە!

کوڕەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: لە ژیانمدا هیچ کات گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی باوکم نەبووم، لە بەرامبەردا زیانی زۆرم چەشت، ئێستا چ عەیبی هەیە ئەگەر وەسیەتەکەی باوکم جێبەجێ بکەم، کە لانی کەم لە دنیادا کەمتر شەرمەزار دەبم!

گەڕایەوە ماڵ، گوریسو تەپڵەکی ئامادەکردو چووە ئەو ژوورەی کە باوکی پێی وتبوو، گوریسەکەی بەست بە ئەڵقەکەوە، پاشان گوریسەکەی خستە ملیەوەو تەپڵەکەکەی لە ژێر قاچی خۆی لابرد، لەو کاتەدا ئەڵقەکە کەوتە خوارەوەو کوڕەکە کەوتە سەرزەوی، سکە زێڕەکان ڕژان بەسەریدا!!

کوڕە بازرگان بەم دیمەنە زۆر سەرسام بوو، تێگەیشت کە هەموو ئەو سکە زێڕانە باوکی لەو شوێنە دایناوەو ویستویەتی کوڕەکەی لە کاتێکدا کە دووچاری دەردەسەریو هەژاریو نائومێدی دەبێتو تێدەگات کە هاوڕێکانی کەسانی هەلپەرستو چاوچنۆکن، لەو کاتەدا ئەم سکە زێڕانە ببێتە هۆی گەڕانەوەی ئومێدو ڕزگاربوونی لە هەژاریو دەردەسەری ژیان، ئەو کات تێگەیشت کە باوکی تا چ ئەندازەیەك دۆستی ڕاستەقینەو خەمخۆرو دڵسۆزی بووە..

دواتر تەواوی سکە زێڕەکانی کۆکردەوەو ڕۆیشت بۆ لای دایکی، بینی دایکی دەستەو ئەژنۆ لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا دانیشتووەو خەم بووەتە میوانی! کوڕەکە سکەیەکی زێڕی دایە دەستی دایکیو وتی: دایەگیان هەستە خواردنێکی باشمان بۆ ئامادە بکە، تا پێکەوە نۆشی بکەین!

دایکی بە بینینی سکە زێڕەکە زۆر خۆشحاڵ بوو، بەسەرسوڕمانەوە پرسی: ئەم سکەیەت لە کوێ هێنا؟

کوڕەکە گوتی: دوای ئەوەی هەموو کاروبارمان ڕاوەستاو هیچ پارەو سامانێك، تەنانەت هیچ کەلوپەلێکی ناوماڵمان نەما، دیارە ویستی خودا وایە کە جارێکی دیکە، ژیانو گوزەرانو کاروبارمان وەکو جاران بگەڕێتەوەو پەند لە ڕابردوو وەربگرین، دوای ئەوە دەزانم چۆن ژیان بگوزەرێنمو دۆستو دوژمن بە باشی بناسم.

دایکی گوتی: سوپاس بۆ خودا، کە سەرەنجام هۆشت هاتەوەو تێگەیشتیت کە هاوڕێکانت کێن، ئێستا پێم بڵێ ئەو سکە زێڕانەت لە کوێ هێناوەو ئەم قسانە کێ فێری کردوویت؟

کوڕەکە گوتی: ئەو سکە زێڕانە باوکم پێیداوم، ئەو قسانەش هەر باوکم فێری کردم!

دایکی گوتی: لەم سەودایە تێناگەم، باوکت چەند ساڵە کۆچی دوایی کردووە؟

کوڕەکە تەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ دایکی گێڕایەوە، ئیدی بەڵێنی دا کە ژیانو گوزەرانیان دووبارە باش بکاتەوەو بە وێنەی ئەو ژیانەی کە باوکی بۆی فەراهەم هێنابوون.

کوڕە بازرگانەکە بۆ ڕۆژی دواتر ڕۆیشتە بازارو هەموو ئەو شتانەی کە فرۆشتبووی، بە زیادەوە کڕییەوەو هێنایەوە بۆ ماڵ، پاشان ڕۆیشت دوکانەکەی باوکی کردەوەو بە وێنەی باوکی دەستیکرد بە بازرگانیکردن.

هاوڕێکانی کاتێك هەواڵیان بیست کە ژیانو گوزەرانی کوڕە بازرگان زۆر باشبووە، دووبارە هاتنەوەو دەوریان لێدا، کوڕەکەش جارێکی دیکە تێکەڵاوییان بووەوەو بە گەرمی بەخێرهاتنی کردن، ئەوانیش وەکو جاران لەگەڵیدا گەرموگوڕبوونەوە، ڕۆژێك هەمووانی بۆ خوانی نیوەڕۆ بانگهێشتکرد بۆ هەمان ئەو باخچەیەی پێشوو..

ڕۆژی میوانی هاتە پێش، کوڕە بازرگان بە دەستی خاڵی چوو بۆ لایانو پێی وتن: هاوڕێیان ببورن ئەمڕۆ چێشتلێنەرەکەمان سەرقاڵی دروستکردنی کفتە بوو، دەیویست بۆ نانی نیوەڕۆ کفتەمان بۆ دروست بکات، مشکێك هاتو گۆشتە قیمەکەی هەڵگرتو فڕاندی..

یەکێك لە هاوڕێکانی گوتی: هەفتەیەك پێش ئێستا چێشتلێنەرەکەی ئێمەش گۆشتی دەدا لە قیمە، مشکێك قیمەکەی لێفڕاند.

یەکێکی دیکەیان گوتی: ئەوە هیچ نییە، چەند ڕۆژێك لەمەوبەر مشکێك هاتە نێو چێشتخانەکەمانەوە، چێشتلێنەرەکەمان ویستی زیرەکی خۆی بنوێنێت، دوای کەوت لێرە بۆ ئەوێ، تا خۆی کرد بەناو کونەکەیدا، ئیتر دوای ئەوە هەواڵمان لێنەما ئاخۆ زیندووە، یا تۆپیوە..

کوڕە بازرگان، هەموو ئەم قسانەی بیست، پاشان وتی: (باشە بۆچی ئەو ڕۆژەی کە وتم سەگ بوخچەکەمی بردووە، هیچ کام لە ئێوە باوەڕی پێنەکردم، تەنانەت منتان لەگەڵ خۆتان بانگ نەکرد بۆ نانخواردنیشو ڕێگەتان نەدا لەگەڵتان دابنیشم؟)

کەسیان وەڵامیان نەدایەوە، بە تەریقییەوە سەیری یەکتریان دەکرد..

کوڕەکە وتی: بەڵێ، ئەو ڕۆژەی کە من داماوو بێچارەو بێ پارە بووم، قسەی ڕاستم گوت، بەڵام کەستان باوەڕتان پێنەکردم، بەڵام ئەمڕۆ کە ماڵو سامانم هەیە درۆکانم قبوڵ دەکەنو بەڕاستی دەزانن، بۆ دڵدانەوەو دڵخۆشکردنی من، ئەو هەموو درۆ شاخدارەتان ڕێکخست..

ئێوە وانەو پەندێکتان فێری من کرد، کە تا ڕۆژی قیامەت لە بیری نەکەم!

دوای ئەوە گەڕایەوە سەر دوکانو بازرگانییەکەی خۆیو بەردەوام بوو لە بازرگانیکردن، تا ئەو ساتەی بووە یەکێك لە بازرگانە دەوڵەمەندو ناودارەکانی ئەو شارە!

ئاسۆ حاجی

# خۆی ناوی لێنام سێبەر

لە گەڕەکەکەماندا نزیکترین هاوڕێم بوو، زۆرهۆگری یەکتربووین، زۆربەی ڕۆژەکان لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ بە یەکەوە یاریمان دەکردو نانی نیوەڕۆمان لە ماڵی ئێمە بە یەکەوە دەخوارد، چونکە ئەو هیچ براوخوشکی نەبوو، بۆیە (سێبەر) هەر لەگەڵ من بوو، لەماڵەوەش پیرەپیاوێكو پیرەژنێكو ئافرەتێکی گەنجبوون، کە ئەو ئافرەتە گەنجە دایکی بوو، بە پیاوە پیرەکەشی دەوت باوکە، پیرەژنەکەش داپیری بوو، بەڵام زۆر لەلام سەیربوو، بۆچی باوکی واپیرە لە چاو دایکیدا؟! لەگەڵ ئەوەشدا هیچکات ئەو پرسیارەم لێنەکردبوو.

لە هەموو شوێنەکانی ژیان هەر لەگەڵ یەکبووین، بۆ گەشتو سەیرانیش بچووینایە لەگەڵ خۆمان دەمانبرد، بە هۆی ئێمەوە ماڵەوەشمان لەگەڵ ماڵەوەیان هاتووچۆو سەردانکردنیان هەبوو، وەك یەك خێزانمان لێهاتبوو. منو سێبەر هەموو نهێنییەکی یەکتریمان دەزانی، هەبوونیو هەژاریو خۆشیو ناخۆشی، هەتا ئەو ڕۆژەی کە مارەکردنی (هێلینی) هاوسەری بوو، ماڵی خەزورانی وایاندەزانی من برای ئەوم، تەنانەت دوای گواستنەوەش لەلای هەندێکیان وا تێدەگەیشتن.

ئێستاش منداڵەکانی من لەگەڵ منداڵەکانی ئەو بە یەکەوە یاری دەکەن، هەروەکو ڕابردووی منو سێبەر، سێبەر باوکی زۆرخۆشدەویست، زیاتر لە کەسانی تر خۆشەویستی بۆ باوکی هەبوو، زۆر هۆگری بوو، لە منداڵیو پاش هاوسەرگیریش زۆر ڕێزی دەگرت، هیچ کات دڵی باوکی نەدەشکاند، باوکیشی بەرامبەر سێبەر ئەوهابوو، هەرکات لەهەر شوێنێك بگەڕابایەتەوە دیارییەکی بۆ دەهێنا، ئەگەر بچوکیش بوایە، ئەو ساتانەی سێبەر منداڵ بوو، شەوان لە لای باوکی دەنووستو سەریان دەکردە سەر یەك سەرین، باوکیشی چیرۆكو بەسەرهاتی بۆ دەگێڕایەوە هەتا خەوی لێدەکەوت، سێبەر هەموو کات بە (بابەگیان) بانگی دەکرد، باوکیشی هەربە کوڕە شیرینەکەم بانگی دەکرد، ئەوها ڕێزیان لە یەك دەگرتو یەکتریان خۆشدەویست.

بەیانی بوو، تازە خۆر سەری دەرهێنابوو، زەنگی مۆبایلەکەم لێیدا، سەیرم کرد سێبەر بوو، هەر کە وتم ئەلوو یەکسەر بەدەم گریانەوە وتی فریام کەوە.. فریام کەوە.. زوو خۆت بگەیەنە لام، هەر کە گەیشتمە حەوشەکەیان هاواری کرد بابەگیان بەجێیهێشتم، تەنیای هێشتم، ئەوەندەی وت نەیتوانی هیچی تر بڵێت، چونکە وشەکانی بۆ کۆنەدەکرایەوەو فرمێسك بەسەر ڕومەتیا جۆگەلەی بەستبوو، چاوەکانی ببوونە گۆمی خوێن، زۆر بۆی گریا، کەسم نەدیبوو ئەوەندە بۆ دایکیشی گریابێت، بەڵام یەك وشەی ناشوکریشی دەرنەبڕی، بەڵکو هەروەك چۆن پێغەمبەری خودا (درودی خوای لە سەر بێت) دەگریا کاتێك ئیبراهیمی کوڕی وەفاتی کردو دەیفەرموو: (دڵ خەمبار دەبێو چاو فرمێسك دەڕێژێت... بەبێئەوەی زووبان وشەیەکی خراپو ناشوکری دەر ببڕێت).

ئەوەی زۆر سەیر بوو لەلام ئەوپرسیارەبوو کە چەندین ساڵە لە ناخم بوو، هیچ وەڵامیشم پێنەبوو، ئەوەبوو دەمگوت بۆچی باوکی واپیرەو دایکیشی گەنج؟! بەڵام وەڵامەکەم لە لافیتەی پرسەکە دەستکەوتو دەرگای بۆ کردمەوە، پرسیارەکەم ئاراستەی سێبەر بکەم، ئەوەی لە سەر لافیتەی پرسەکان نووسرابوون، (پرسەو سەرەخۆشی خۆمان ئاراستەی بنەماڵەی سێبەر دەکەین، بە بۆنەی کۆچی دوایی باپیری)، تێگەیشتم ئەو پیاوەپیرە باپیری بوو، ئەی باوکی؟! دوای پرسەکە سێبەر پێی وتم: باوکم بەر لە بوونی من بە سێ مانگ سەیارە لێیداوەو کۆچی دوایی کردووە، من باوکی خۆم نەبینیوە، بەڵام باپیرم هیچ کات نەیهێشتبوو هەست بەم بۆشاییە بکەم، هەرخۆشی ناوی لێنام سێبەر، بەو واتایەی منی وەك سێبەری باوکم دادەنا، ئەگەر ئەویش نەبێت سێبەری هەبێت، خۆشی ببێتە ئەو سێبەرەی کە من لێی بێبەش بووم، واتا ئەو لە جێی سێبەری باوکم بێت بۆ من، منیش سێبەری باوکم بم بۆ ئەو، وتیشی بۆیە هیچ کات باسم نەکردووە، چونکە خۆم بەبێ باوك نەزانیوە، بێ وەفایو بێ ویژدانی بوو، ئەگەر بم وتایە باوکم نەماوە!



# گفتوگۆ، دەرمانی کێشەکانە

ئا: بەرزان بەکر.. هەولێر

کێشەگەلی زۆر هەیە کە نازانین چۆن رووبەرووی ببینەوە، چ دەرمانێکی بۆ بێنین. وتراوە هەموو دەردێك دەرمانێکی هەیە جگە لە مردن، ئەوەی ئێمە ناوی دەنێین دەرمانی کێشەکان، ئەم دەرمانە بێ ماددەی کیمیاییە، بریتییە لە گفتوگۆ، زۆرێك لەو کێشانەی کە ئەمرۆ لە ژیاندایە چ لە نێوان، دوو دەوڵەت، دوو گروپ، دوو خێزان، دوو مرۆڤ، دوو هاورێ، بەڕێوەبەرو فەرمانبەرەکانی، هاوسەران، باوكو منداڵەکانی، مامۆستاو خوێندکارەکانی ..هتد، لە ئەنجامی تێنەگەیشتن لە یەکدییەوە دروست دەبێت، لەوەش کێشەتر، مامەڵەنەکردن لەگەڵ کێشەو گرفتەکاندا، پەنانەبردنەبەر ڕێگەی گفتوگۆو دایەلۆگە، کە سەرئەنجام سەرهەڵدەدات بۆ کێشەی تری ئاڵۆزتر لەوەی پێشوتر. بۆیە ئەگەر بمانەوێت بێ زیان لە کێشەکاندا رزگارمان بێتو بتوانین بەشێوەیەکی ئەرێنی چارەسەریان بکەین، ئەوا لە ڕێگەی گفتوگۆو تێگەیشتن لە یەکدی، بە باشترو شیاوتر نابینم. سێ بایەخی گەورە لە گفتوگۆدا هەیە:

١- گفتوگۆی هێمنانە رۆڵێکی جدی هەیە لە چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانو پتەوکردنی کاری هاوبەشی نێوان دوو کەس، بۆ نموونە مامۆستاو خوێندکار، ئەگەر ڕێگای دایەلۆگیان گرتەبەر لەو پێشهاتانەی کە رووبەروویان دەبێتەوە، ئەوا دەتوانن برەو بەو کارە هاوبەشەی نێوانیان بدەنو هەردووکیان سوود لە یەکتر وەربگرنو ببنە تەواوکەرو بەرەو پێشبردنی رۆڵی یەکتری، قوتابی بەبێ مامۆستا نابێتو هەروەها مامۆستاش بێ قوتابی نابێت. یان دڵسۆزکردنو جدی کردنی کاری نێوان بەڕێوەبەرو فەرمانبەرەکەی لە ڕێگەی مامەڵەیەکی تەندروستو ئارامی نێوانیان لەو کێشەی کە بەرۆکیان دەگرێت.

٢- لابردنو کاڵکردنەوەی جیاوازیو دووبەرەکی، بەرەوپێشبردنی خاڵە هاوبەشو لێك نزیکەکان، چونکە جیاوازی شتێکی سروشتیەو زۆر ئەستەمو قورسە کە لە نێو ببرێت، ئەگەر جیاوازی نەبێت خاڵە هاوبەشەکان نابینرێن. خوای گەورە لە ڕەنگو دەنگو شێوەو تەنانەت نەخشی سەر پەنجەمانی جیاواز خوڵقاندووە. گفتوگۆو جیاوازی هەردەم لە ملمانێدان، بەوەی کە گفتوگۆ هەوڵدەدات کاڵیبکاتەوە، هەڵبەتە زیاتر لە جیاوازی فکرو هزریو سلوکی نێوان تاکەکان دووری دەخاتەوە.

٣- گەیشتن بە ئەنجامێكو خاڵێك، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێتە هۆی زویرنەبوون لە یەکدی، بەوەی دەگەن بە چارەسەرێکی باش، یان ئەگەر جیابوونەوەش بێت، ئەوا بەشێوەیەکی تەندروست جیادەبنەوە، نەك بە ڕێگەگرتنو شێوازێکی نا تەندروستو نەرێنی.

چەند بنەمایەك بۆ گفتوگۆی سەرکەوتوو و ئەرێنی:

١- وتووێژکردن بە شێوەیەکی ئەدەبیانەو بە نەرمو نیانی: زۆرێك لە مرۆڤەکان کاتێك کێشەکان دێتە ڕێیان لەگەڵ کەسی بەرامبەردا، ئەوا بەشێوەیەکی نا ئەدەبیو دوور لە ڕەفتاری مرۆڤانە دەستپێدەکەن، یان بەکارهێنانی چەند پەیڤێکی بازاڕیو نا مۆڕاڵی، کە دەبێتە هۆی دڵشکانی کەسەکە، برینی شمشێر زوو چاك دەبێتەوە، بەڵام برینی دڵ، یان هەر چاك نابێتەوە، یان زۆری دەوێت چاك بێتەوە.

٢- ڕێزگرتنی کەسی بەرامبەر وەکو مرۆڤێك: چونکە خاڵی هاوبەشو سەرەکی نێوانمان ئەوەیە کە تاکی بەرامبەر مرۆڤە، ئەو کەسە کەسایەتیەکی تایبەتی هەروەکو ئێمە هەیە، خاوەن هزری خۆیەتی کاتێك ئێمە ڕێزی ئەومان گرت، ئەوا ڕێزی خۆمان گرتووە، مامەڵەی جوان لەگەڵیدا، مامەڵەی جوانە بەرامبەر خۆمان، چۆن کاتێك ئێمە قسەدەکەین حەز دەکەین کەسی بەرامبەر بە تەرکیزەوە گوێمان بۆ بگرێت، بە هەمان شێوەش ئەو کەسەش حەز دەکات ئێمە بە تەرکیزەوەو بە جوانی گوێی بۆ بگرین.

٣- هەوڵنەدان بۆ سەپاندنی ڕاوبۆچوونی خۆمان: مرۆڤەکان خاوەنی یەك بڕیارو هزر نین، ئەمە ڕاستییەکەو دەبێت بزانین. ئیمامی (مالك) دەڵێت: (لا تحسم الخلف، دع الناس وما اختلفوا)). واتە: جیاوازی کۆتایی پێ مەهێننو یەکلای مەکەنەوە، واز لەخەڵکی بێنن لەو شتانەی لەگەڵ یەکدیدا جیاوازن.

٤- لابردنی جیاوازی: هەرکاتێك دەستت بە گفتوگۆکرد بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، هەوڵبدە لە خاڵە هاوبەشەکانەوە دەست پێبکەیت، چونکە کلیلێکە بۆ چوونە نێو ژووری سازدانی گفتوگۆ.

٥- دەستپێکردن لە گرنگترینەوە: گرنگترین خاڵەکان گرنگترو جێگای پێشخستنە، وەك لە خاڵە لاوەکییەکانو بچووکەکان، بۆیە کەسە خاوەن هۆشەکان لەو خاڵەوە دەستپێدەکەن کە زیاتر پێویست بە چارەدەکاتو جێگەی مەترسین لە گەورەکردنی کێشەکە.

٦- دانان بە ڕاستییەکاندا: بە داخەوە کە ئێستا زۆرێك لە تاکەکان کاتێك کە دەگەن بە ڕاستیش، نکۆڵیو کەللەڕەقی دەنوێنن بەرامبەر بە حەقو ڕاستییەکە، پێشەوا عەلی دەڵێت: ((ئەگەر حەق لە کەسێکەوە بوو کە دوژمنیش بوو دەبێت وەریبگری، ناحەقیش لە هەرکەسێکەوە بێت، ئەگەر دۆستی خۆشت بێت، نابێت وەریبگری)). پێشەوا شافعیش دەڵێت: ((مشتو مڕی زانستیم لەگەڵ هەرکەسێك کردبێت، لە خودا پاڕاومەتەوە کە حەق بەزمانیدا ئەودا بێت)).

٧- دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی ڕاناوی «من» لە کاتی گفتوگۆدا: زۆرجار لە هاوڕێکانمانەوە دەبیستین کە دەڵێن مامۆستا، یان فلان کەس زۆر «من منێتی». بۆیە ئەمە خاڵێکی جەوهەرییە لە گفتوگۆکردندا، بۆئەوەی میزاجی کەسی بەرامبەر بێزار نەکەین.

نامەی شەشەم

# نامە نوریەکان

ئازیزم لە نامەکەتدا سکاڵادەکەی، لە دەستی (نەفسی ئەممارە)و وەشیومەی تاوانو گوناهو زاڵبوونی ئارەزووەکانو دەسەڵاتی نەگریسی شەیتان..

سکاڵای تۆ، سکاڵای هەموومانە، دەردی تۆ دەردی هەموومانە، ئێمەش گیرۆدەی تاوانو گوناهین، دەستەمۆی نەفسی بەدکردارو بەندو کۆتی دنیای فانیین..

تۆ بە ئاهی ساردو فرمێسکی گەرمت، دڵی منیشت وریاکردەوە!!

ئێمە هەمیشە گێژاوی غەفڵەت بێ ئاگامان دەکاتو بەشێوەیەك مەستی خۆشییە کاتییەکانی دنیای فانی دەبین، کە تاوانو گوناهەکانمان بیردەچێتەوەو لە یادمان دەچێت کە ئێمە لەو ڕۆژەوە هاتووینەتە ئەم دنیایە، بەرەو گۆڕو مەنزلگای قیامەت هەنگاو دەنێین!!

لەبەرئەوە وەکو (مەحوی) دەڵێت:

ئەسیرو سەیدی قەیدی کەیدو شەیدی نەفسی ئەممارەم
لە دەست ئەم مارە بەدچارە، چییە چارەم، خوداچارەم!

چەند بە جوانیش گوزارش لە ناخی ئێمە دەکات، کە دەڵێت:

خەیاڵی پوچی دونیا وا دەماغو دڵمی پێچاوە
قیامەت، هەر مەگەر ڕۆژی قیامەت بێتەوە فیکرم

هەموومان وەدووی سەرابی دونیا کەوتووینو هەرچەندەی ڕادەکەین نایگەینێ، هەر دەڵێین: ئەمڕۆ نا سبەی، بە تەواوی دەگەڕێینەوە، بۆ لای خوداوەندو دەستبەرداری تاوانو گوناهەکانمان دەبین، بەڵام هێندەمان لەلا شیرین بوون، نەفسو شەیتان هێندەیان ڕازاندۆتەوە، بەشێوەیەك ئاوێزانیان بووین ناتوانین وازیان لێبهێنین..

نامەکەی تۆ برینی زۆرێکمان دەکولێنێتەوە، شوێنەواری فرمێسکەکانت بە ڕومەتی نامەجوانەکەتەوە دەدرەوشێتەوە.. بێهیوا مەبە ئازیزم هێشتا دڵە سپییەکەت ژووانی خۆشەویستی خودایە!!

هەست دەکەیت کانیاوی فرمێسکت وشكو بێئاوەو باخچەی دڵە میهرەبانەکەت زەردهەڵگەڕاوەو نەرمەڵانی ناخت بۆتە بەردەڵانێکی ڕەقو تەق!!

هەق بە تۆیە مرۆڤ لە وەها بارودۆخێکدا سەرفرازیو شادمانی ماڵوایی لێدەکەنو دنیای لێ تاریك دەبێتو تروسکاییەك بەدی ناکات، بەسەر زەویدا وەکو گەدایەکی بێکەسو دێوانەیەکی سەرلێشێواو هەنگاو دەنێتو نازانێت رووبکاتە کوێ!!

چونکە مرۆڤ کاتێك هەستدەکات لە پەروەردگاری دوورکەوتۆتەوە، هەست بە غوربەتو نامۆییەك دەکات، بەشێوەیەك وا هەستدەکات لەگەڵ خودی خۆشیدا نامۆیە!

گەورەترین خۆشەویستی مرۆی باوەڕدار خودای پەروەردگارە، ئەو کات لەو خۆشەویستەی دووردەکەوێتەوە، ناری هیجران گڕ لە ناخی بەردەداتو خونچەی خۆزگەو ئاواتەکانی بە گڕەی ئەو ئاگرە هەڵدەپروکێنێ.

ئەوەی خۆشەویستەکەی خۆی وێڵ کردبێ، ئیدی دەبێت بە چی دڵخۆشبێت؟؟

ئافرەتێك بە دەوری کەعبەدا تەوافی دەکردو بە کوڵ دەگریا، بە سۆزێکی بێسنورو دڵێکی شکاو بە دەم نزاو لاڵانەوەوە فرمێسکی گەرمی دەڕشت..

لێیان پرسی: پێدەچێت کەسێکی زۆر ئازیزت لە دەستدابێت؟!

گوتی: لەو ئازیزتر!!؟ من دڵی خۆم لە دەستداوە، من وێڵی خۆشەویستەکەی خۆمم، بە هۆی گوناهو تاوانەوە لە دەستمدا!!

کاتێك لە دەریای میهری خودایی دووردەکەوینەوە، ئەوسا دەزانین ئێمە بێ سۆزی ئەوو بێ میهری ئەو، چەندە سەرگەردانو ماڵوێرانین..

وەختێك دەبینین خودامان لێ زویرە، ئیتر خەندەو پێکەنینی دنیا دڵخۆشمان ناکەن..

وەختێك لە تامو چێژی گفتوگۆ لەگەڵ خودادا مەحروم دەبین، ئیتر تاموچێژی هیچ خواردنو خواردنەوەیەك ناکەین..

وەختێك لە بەهەشتی بەرینی خواپەرستی پەراوێز دەگرین، ژیانمان پەرێزێکی زەردەو دڵیش خیابانێکی خامۆش.

ئیبنولجەوزی لە بارەی بەهەشتی ئیماندارانەوە دەڵێت: (ئێمە لە بەهەشتێکدا دەژین، خۆراکەکەی خشوعە لە نوێژەکانماندا، خواردنەوەکەشی ئەسرینی چاوەکانمانە) (نحن في جنة طعامها الخشوع، وشرابها الدموع)..

ئازیزم، مرۆڤ وێڕای تواناو بەهرەیەکی زۆر کە خودای گەورە پێی خەڵات کردووە، لاوازی رووی تێدەکاتو دڵەکانیش هەمیشە وەکو خۆیان نامێنن.

ئێمەی مرۆڤیش فریشتەنینو ناتوانین بێ گوناهانە، بەسەر رووی زەویدا گوزەربکەین، بەڵام گرنگ ئەوەیە لەگەڵ تاوانەکاندا تۆبەو گەڕانەوە فەرامۆش نەکەین!!

وەکو منداڵێکی دڵشکاوو بەندەیەکی هەڵاتوو بەرەو لای خوداوەندی میهرەبانو میهربەخشو بەسۆزو لێبوردە، بە کەساسی هەنگاو بنێین!!

خوداوەندی ئێمە، (رحیم)ە، (رحمن)ە، (غفور)ە، (ودود)ە، (رؤوف)ە، (غفار)ە، (تواب)ە..

دەریای میهرەبانی هەموو دنیای داپۆشیوە..

خودای ئێمە، پێی خۆشە بیسەری (یا رب، یارب،)و (یا الله، یا الله)ی ئێمە بێت، لە بەرەبەیانی سەحەردا..

پێم سەیرە نووسیوتە لە نامەکەتدا، نازانم چۆن لە خودا بپاڕێمەوە، نازانم چۆن نزاو دوعاکانم بکەم..

هاوڕێی لە دڵاشیرینم: وەختێك ئەوینو خۆشەویستی خودا لێوانلێوی دڵەکان دەبن، ئیتر پێویست بە هیچ رەوانبێژیو بەیانێك ناکات، بۆ دەربڕینی سۆزو خۆشەویستی، دەستەکانت بڵندبکە، نیگات ببڕە عەرشی خودا، بڵێ: پەروەردگارم منی بەندەی بچووکت ئومێدم، بە گەورەییو فەزڵی بێسنوری تۆیە، بمبورە، لێمخۆشبە، دەستم بگرە، بەرەو لوتکەی نورو هیدایەت، خۆم دەدەمە دەستی تۆ، تۆش بمخەرە ژێرسایاتی سۆزو میهرەبانی خۆت، مەمدەرە دەستی شەیتانو نەفسی بەدکارم..

خودایە گوناهی من هەرچەندە گەورەبن، سۆزو میهرەبانی تۆ گەورەترە، خودایە تۆ بەندەی وەکو من خراپو زۆر باشیشت زۆرن، بەڵام ئەمن جگە لە تۆ خودایەکی تر شك نابەم!

ئەگەر تۆ لە دەرگای خۆتم وەدەرنێی، ئیتر لە دەرگای کێ بدەم؟؟

من هەر تۆ دەپەرستم، بۆ گەورەییت کڕنووش دەبەم، هەرچەندە شەرمەندەو خەجاڵەتم، بەڵام هەرگیز لە بەزەیی تۆ بێ هیوا نابم....!

لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ

ع.ش. شێرکۆ

# لەگەڵ تاهیربەگی جافدا

ئەدەبی کوردی [10]

تابەکەی قوربان بناڵم من بە ئێش‌و دەردەوە
دەس بە ئەژنۆ قوڕ بەسەر دایم بە ئاهی سەردەوە
ڕۆژی ئەوەڵ بوو، کە زانیم من ئەبێ دێوانەبم
ئاشقی تۆ، نەوعی مەجنون، وا بەکێوو هەردەوە
مەرحەمەت کە، زوو بڕۆ قاسید بڵێ دەردی دڵم
نازی پاپوچت ئەکێشم، من بە تۆزو گەردەوە

شاعیری گەورەی عەشیرەتی جاف، (تاهیربەگی کوڕی وەسمان پاشای جاف) لە ساڵی (١٨٧٥)ی زاینی لە شاری هەڵەبجە لە دایکبووەو ساڵی (١٩١٧)ی زاینی لە تەمەنی (٤٢) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

وێڕای تەمەنی کورتی شاعیر (تاهیر بەگ)، بەڵام شیعرەکانی لە ئاستێکی هێندەبەرزدان کە نموونەن بۆ شیعری ناوازە لە ئەدەبی کلاسیکی کوردی دا.

وەسفێکی دڵڕفێن، ڕەوانبێژی‌و بەلاغەت، ناسکی، هەستی جوان‌و ئەوینێکی پڕخرۆش، سیمای جوانی شیعرەکانی تاهیر بەگن.....

دڵ لە هیجرەت وا لە خەمدا ماهی کەنعانم وەرە
زەخمە جەرگم بۆ فیراقت زووبە لوقمانم وەرە
سەد تەبیب هات‌و عیلاجی ئەم برینانەی نەکرد
تۆ عیلاجی زەخمەکەم کە، سا بە ئامانم وەرە
گەر دەزانی چەند پەشێوە، حاڵەکەم بۆ دیدەنت
سەد ئەوەندەی زوڵفەکانت دڵ پەرێشانم وەرە

لە یەکێك لە شاکارەکانیدا دەڵێت:

عەجەب سرڕێ لە ئەبرۆتا بەیانە
موخالیف پێکەوەن هەم تاق‌و هەم جووت

مەبەستی لە کۆبوونەوەی دوو هیلالە، بەیەکەوە، کە چۆن جووتن لەگەڵ یەك!

(تاهیر بەگ) لە گەشتەکانیدا بۆ ڕاوشکار بە دەمانچە پەنجەیەکی خۆی دەپێکێ‌و بەو بۆنەیەوە دەڵێ:

فەلەك زانی کە دەشکێ بازاڕی مانگو خۆر
شکاندی پەنجەکەم تا من نەنووسم وەسفی ڕووخساری

سەبارەت بە فەلسەفەی ژیانیش دەڵێت:

عالەم هەموو وەك تەیرە، تەمەع دانە، ئەمەل داو
سەییادی ئەجەل، ساحەتی دونیا قەفەسێکە

یەکێك لە شیعرە بەرزەکانی (تاهیر بەگ) تەخمیسێکە لەسەر شیعری شێخ ڕەزای تاڵەبانی کە تیایدا دەڵێت:

من کوشتەیی چاوانم‌و چاوانی لە من ون
دەردو ئەلەمیش گشتی بەوە لێم بووە دوژمن
بۆ چاك‌و شەفاکردنی ئەم دەردە دەوا چن؟
(حەیرانن ئەتیببا لە عیلاجی مەرەزی من
لوقمانی ویسالی مەگەر ئەم دەردە دەواکا)

لەو بوارانەی کە (تاهیربەگ) زۆر تیایدا سەرکەوتوو بوو، وەسف‌و مەدحی پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێبێت)، کە خۆی دەڵێت:

نەعتی شاهی ئەنبیا (تاهیر) کە هاتە سەرزوبان
جیلوەبەخشی زەوقە ئیمرۆ نەزمەکەی پڕ شەککەرم

هەربۆیە یەکێك لە شیعرە بەناوبانگەکانی کە (ناری) شاعیریش تەخمیسی کردووە، ئەم شیعرەیە لە وەسفی پێغەمبەردا (سەلامی خوای لێبێت)، کە بە یەکێك لە شاکارەکانی (تاهیربەگ) دادەنرێت:

مەتلەعی سوبحی سەعادەت مەزهەری (علم الیقین)
ئەی سپەهسالاری فەوجی ئەنبیائو مورسەلین
بۆ نەوازش، زاتی حەق هەم حوججەت‌و هەم دەنگی بۆ
شاهیدی تەعزیمی تۆ بوو، یاوەری ڕۆحولئەمین
موشکی تۆزی دامەنت، عەتری دەماغی ئەتقیا
یەعنی بۆ تەئسیری بینش، عەینی سورمەی خاکبین!

شێخانی